# ناکۆکیەکانی
# ناو
# سیاسەت

## THE PARADOXES OF POLITICS

ـ سەرەتایەک بۆ تیئۆری سیاسی فێمێنیستیی
An Introduction to Feminist Political Theory ـ


Maria Wendt Höjer ماریا ڤێندت هۆیەر
Cecilia Åse سیسیلیا ئۆسە


وەرگێڕانی لە سوێدیەوە
Translated into kurdish

Rebwar Rashed
ڕێبوار ڕەشید

Maria Wendt Höjer ماریا ڤێندت هۆیەر
Cecilia Åse سیسیلیا ئۆسە

# ناكۆكیەكانی ناو سیاسەت
# The Paradoxes of Politics

ـ سەرەتایەک بۆ تیئۆری سیاسی فێمێنیستیی
An Introduction to Feminist Political Theory ـ

وەرگێڕانی لە سوێدیەوە
Translated into kurdish

**Rebwar Rashed**
ڕێبوار ڕەشید

كاری نووسین و مونتاژ: ڕێبوار ڕەشید
ISBN 91 – 631– 7115 – 5

تێبینی:



* ئەم كتێبە لەلایەن دەزگای ئاراس ـ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە كۆتایی بەهاری ٢٠٠٦ بڵاوكراوەتەوە. سوپاسیان دەكەم، بەڵام بەداخەوە لە نووسینەوەكەیدا هەندێك هەڵەی واژەیی و جۆری هەڵەی دیكەی تێدا كراوە.

Förord till översättningen

Det är en stor glädje för oss att *Politikens Paradoxer* har blivit översatt. Att denna översättning kommit till stånd är helt och hållet ett resultat av Rebwar Davodis insatser. Vi vill varmt tacka honom.

Stockholm i april 2005

Maria Wendt Höjer Cecilia Åse

سەرەتایەک بۆ وەرگێڕانەکە
خۆشیەکی گەورەیە بۆ ئێمە کە کتێبی "ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت" وەرگێڕدرا. ئەرکی ئەم وەرگێڕاندنە تەواو کەوتە سەرشانی ڕێبوار ڕەشید. بە گەرمیی سوپاسی دەکەین.

ستۆکهۆڵم، مانگی چواری ٢٠٠٥، ماریا ڤێندت هۆیەر و سیسیلیا ئۆسە

زانیاری سەبارەت بە کتێبەکە و بنکەی چاپ
Some information about the publishing house and the book

**Academia Adacta AB**
Anne-Marie Beckman
Box 1015
221 04 Lund
Sweden
Tel 046-29 50 55
Fax 046-29 50 80
E-mail: academia.adacta@insatnet.nu

The Paradoxes of Politics
- An Introduction to Feminist Political Theory


Edition 1:1
Original title in Swedish: Politikens paradoxer – En introduktion till feministisk politisk teori. Published in Sweden, Academia Adacta AB, 1996.

## ناوەڕۆک

## سەرەتایەک بۆ وەرگێڕانەکە

ڕۆژی ٢٠٠٢/٧/٢٧ بڕیارمدا کتێبی "ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت" لە سوێدیەوە وەربگێڕم بۆ کوردی. پاش پێوەندی کردن لەگەڵ مارییا و سیسلیا کە نووسەری کتێبەکەن و تاووتوێ کردنی باسەکە لە ڕێی ئیمێڵەوە لە گەڵیان، ڕۆژی ٢٠٠٢/١٠/١٠ لە زانکۆی ستۆکهۆڵم کۆبووینەوە و لە لەسەر بڕیارەکە ساخ بووینەوە.

کاتێکی زۆری خایاند تا کارەکە تەواو بوو. هۆی سەرەکیش لە ڕاستییدا ئەوەیە کە بە کۆمەڵێک کار و چالاکی ترەوە خەریک بووم. ئەو کاتەی کە دەمایەوە بۆ وەرگێڕانی "ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت" تەرخان بکەم، بەداخەوە کەم بوو.

سەبارەت بە کاری وەرگێڕانەکە دەبێت بڵێم کە زەحمەتی خۆی تێدا بوو. لەلایەکەوە ئێمە لە کوردیدا ڕێککەوتنێکمان لەسەر مانای وشە و زاراوەگەلێک نییە، بەتایبەتی سەبارەت بە ـ ئیزمەکان و لەوانەش فێمێنیزم، کە لە زۆربەی زۆری زمانە ئەوروپیەکاندا لەسەری ڕێککەوتوون. نەبوونی کۆمەڵێک زاراوە و دەستەواژەی سیاسیی، کولتوریی و فەلسەفیی کە ئەگەرچی لە زمانی کوردیدا هاوواتایان هەیە، بەڵام بەداخەوە بەگشتیی بەکارنابرێن و دانەکوتراون، گرفتێکی دیکە بوو. هەرچەندە نامەوێت بچمە ئاستێکی قووڵتری باسەکەوە، بەڵام بێگومان نەبوونی دەوڵەت یان قەوارەیەکی سەروەری نەتەوەیی بێ لە کۆمەڵێک زیانی گەورە هەروەها زیانی نەبوونی زمانێکی ناوەندیی و ستانداریشی لێداوین کە پێمانەوە دیارە.

گیروگرفتی زمانی کوردی، بەتایبەتی لە باشوور و خۆرهەڵاتدا ئەوەیە کە کەمتر وشەی بە بنەڕەت لاتینی، یۆنانی و ئینگلیزی یان فەڕەنسی بەکار دەهێنین و زیاتر، تەنانەت لە شێوەی داڕشتنی ڕێزمانیشدا، سوود لە عەرەبی یان فارسی وەردەگرین. ئەمە گرفتێک پەیدا دەکات کە بەڕاستی هاسان نییە و ئەویش ئەوەیە کە ناچار دەبین پەنا بۆ وشەگەلێک بەرین کە کارەکەمان سەختتر دەکات وەک لە سووکتر. بۆ نموونە، بۆ هەر پارچەیەکی کوردستان بەکاربردنی ئەو وشە و زاراوانەی لە جیهانی خۆرئاوا برەویان هەیە دەبنە مایەی هاوبەشێتی، نە هەر لە سەر ئاستی کوردستان بەڵکو لە سەر ئاستی جیهانییش، بەڵام تێگەیشتن لە وشە و زاراوەی زمانی داگیرکار هەم ناوچەییە و هەم دەبێتە مایەی زەحمەتی تێگەیشتن لە ناو کورددا.

ئێمە بۆ ئەوەی بتوانین مامەڵە لەگەڵ تیئۆری و سیاسەت و شێوەكانی دیكەی زانستدا بكەین بێگومان پێویستمان بە كۆمەڵێك وشەیە كە كۆدەنگی[1] (هاوڕایی) سیاسیمان لەسەریان هەبێت و لە بەردەوامگوتنەوەیاندا ئەو واتا و ناوەڕۆكە هەڵبگرن كە باسەكە پێویستی دەكات. ئەمەی كە باسی دەكەم بۆ فێركردن و پەروەردەكردنی نەوەكانی ئاییندە زۆر گرینگە. كۆمەڵگای كوردستان بەهەرحاڵ دەبێت بتوانن لە ئاستێكی بڵنددا لە یەك تێبگەن. پێشخستنی زمان مەرجێكی كۆمەڵگای مەدەنیە.

دەبێت ئەوەش بڵێم كە هەوڵی زۆرم داوە وەفادارییم بۆ تێكستەكە لەسەر حسابی وەرگێڕانەكە نەبێت. بۆ هاسانكردنی كاری خوێنەر هەندێک جار وشەیەكی هاوواتام لە نێو كەوانەیەكدا بۆ وشەی پێشەوەی داناوە یان لە بنتێبینییدا ئەو وشەیەم ڕوون كردووەتەوە كە پێموایە پێویستە. بێگومان دەشێت وشەی باشتر و گونجاوتر لەوانەی من هەبن، بەڵام تا ئەو دەم كە ئەو پێشنیازانە پەیدا دەبن ئەو كارەی من وەک هەنگاوێک لە سوود خاڵی نابێت.

وەك باسم كرد لەبەر ئەوەی كە تا ئێستاش زمانی كوردی لە ئاستێكی نزمتردا مامەڵەی پێ دەكرێت و نەچووەتە ناو دامەزراوە سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابوورییەكانەوە، لە گۆڕەپانی سیاسەت، دیپلۆماسی، فەلسەفی و هتددا كەمتر بەكاردەبرێت و لە ئاستێكی وای زانستییدا بەكارناهێنرێت كە شیاوی پێداویستیەكانی نەتەوەیەک بێت، وەرگێڕانی تێكستی زانستی و ئەكادیمی بۆ سەر زمانی كوردی سەختە. خۆماندووكردنێكی تەواوی دەوێت بۆ ئەوەی لە لایەكەوە ئەو ئاستە ڕۆژانەیەی زمانی كوردی جێ بهێڵرێت و لەلایەكی دیكەوە هاوكات كە وەفاداریی بۆ تێكستە ڕەسەنەكە نیشان دەدرێت، ئاستی زمانە كوردیەكەش ببرێتە سەرێ.

هیوادارم توانیبێتم ئەو كارە ئەنجام بدەم. دڵنییام ڕەخنەگرانی دڵسۆز لە ئاییندەدا كاری لەم جۆرە هاسانتر دەكەن. پێش بە كۆتایی هێنانی ئەم سەرەتایە دەبێت سوپاسی مارییا ڤێندت هۆیەر و سیسلیا ئۆسە بكەم كە ڕێگایان دام كتێبەكە وەربگێڕمە سەر زمانی كوردی، كە بێ ئەوەی پێیان بڵێم خۆیان لەو دەقە كوردیەدا كە وەک نموونە بۆم ناردبوون، بژاری بەشە سوێدیەكەی دەقەكەیان كردبوو. سوپاسی گەرمم بۆ كوێستان ـی هاوڕێ و هاوسەرم كە خۆی بە تێكستەكانەوە خەریک كرد و كارەكەی لە زۆر ڕووەوە بۆ هاسان كردم.

---

[1] كەنسێنسەنس: كۆدەنگی، هاوڕایی

هەروەها سوپاسی مەهاباد قەرەداخی دەکەم کە بۆ لە پێشنیاری گرینگ، وەفادارانەش بە تێکستەکەدا چووەوە و تێبینیەکانی وا گرینگ بوون کە کاری لەسەر داڕشتنەوەی تێکستەکە کرد.

سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە کە بێگومان لە پێوەندی لەگەڵ ئەو بزووتنەوەیەدایە کە لەم چەند ساڵەی دوواییدا بیری فێمێنیزم لە ناو کۆمەڵگای کوردستاندا برەوی پەیدا کردووە و کە من پێموایە گەر دروستانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت دەتوانێت ڕۆڵێکی بگۆڕی سوودبەخشی لە کۆمەڵگای کوردستاندا هەبێت. ئەمە لە دەمێکدایە کە هاوکات ئێستا لە ئورووپا بۆچوونێک هەیە کە دەڵێت ئیتر فێمێنیزم بووە بە زاراوەیەکی سواو و چیتر ناتوانێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت کە لە ماوەی ڕابردووی ٢٠ تا ٥٠ ساڵی ڕابردوودا گێڕاویەتی.

ئایا لەو ڕووەوە پیاوان و ئافرەتانی فێمێنیستی کورد لە پاشەوە ماون ؟

بەئەژماردن ئەو ئافرەتە کوردانەی کە خوازیاری بەرەوپێشەوەبردنی دۆخی ئاڵۆزی خۆیانن. بەڵام ژمارەی ئەوانەی کە لە ڕووانگەی گشتیی فێمێنیستیەوە بتوانن داکۆکی بکەن کەمن. ئەو ژمارەیە زۆر کەمتریش دەبێتەوە کاتێک کە دێتە سەر بیری فێمێنیزم لە قوڵایی و پانتایی خۆیدا وەك تیئۆری و سیاسەت.

دۆخی بندەستی نەتەوەیی کۆمەڵگای کوردستان بە هیچ شێوەیەک ئەو بوار و هەلەی نەڕەخساندووە کە مرۆڤی کورد، بەتایبەتی ئافرەتان، بتوانن بەو شێوە دروستەی کە پێویستە خۆیان لە تیئۆرییدا قووڵ بکەنەوە. ئەم ڕاستییە سەبارەت بە پیاوانی کوردیش هەر دروستە.

هەندێک پیاوی کورد هەن (بێگومان ئافرەتیش هەن) کە پێیان وایە فێمێنیزم بزووتنەوەیەکی بەدە و فێمێنیستیش ژنێکە کە پێی وایە هەرچی "خراپ" بێت باشە. خەڵك هەن پێیان وایە بزووتنەوەی فێمێنیزم هەر زیان دەگەیەنێت و قازانجی بۆ کۆمەڵگا نییە. کەمخوێندنەوە و کەمزانین لەسەر بزووتنەوەی فێمینیزم هێندە بەر بڵاوە کە هەر لە خۆوە مەسەلەی جلکوبەرگێک کە تەواو لەش دانەپۆشێت یان سووراو و سپیاوێک کە زیاتر لە باو تۆخ بێت دەبەسترێت بە فێمێنیزم و فێمێنیستییەوە. بەو شێوەیە تێگەیشتنێکی فرە چەوت لە وشەی فێمێنیزم و فێمێنیست لە ناو کورددا هەیە.

گلەیی و گازەندە زۆرن لەسەر ئەوەی کە پرسیاری خراپ سەبارەت بە ئافرەت، بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی ئەوان و فێمێنیزم دەکرێت. بەڵام ئێمە دەبێت تێبگەین کە پرسیاری باش لە زانست و ئەقڵی باش و خوێندنی هەمەلایەنەوە سەرچاوە دەگرێت. تا ئەو دەمەی کورد لەوانە بێ بەش بێت پرسیارەکانیش ئەو ڕەنگە دەدەنەوە. من پێموایە ئەم کتێبە، "ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت" کە بەشێکە

لە خوێندنی بەرنامەی یەکەم ساڵی زانستی سیاسەت لە زانکۆی ستۆکهۆڵم لە سوێد، دەتوانێت گورێک بەو خوێندن و خستنەژێرباسە بدات. کتێبەکە زۆر بە کورتی لەسەر جۆرەکانی فێمێنیزم، چۆنیەتی تێڕوانین و تێگەیشتن و بەڵگە هێنانەوە دەدوێت. بێلەوەش پێداچوونەوەیەکی مێژوویی پێداویستی تێدایە بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر بتوانێت بچێتە نێو باسەکەوە.

هەڵبەتە من نامەوێت بچمە نێو باسێکی ڕەخنەگرانەوە سەبارەت بە فێمێنیزم لە ناو ئەمڕۆی کوردستاندا، بەڵام دەبێت ئەوە بڵێم کە نە هەر باسی فێمێنیزم بەڵکو زۆربەی زۆری نووسیەنەکان بەداخەوە هەر لەسەرەتاوە کەموکورتیی زۆریان تێدایە. کەموکورتییەکان هەر لە نەزانینی دەستووری نووسینەوە دەست پێ دەکات تا کێشەی فکریی گەورە. بۆ نموونە پێڕەوی ئەو ڕێزمان و شێوەنووسینە ناکرێت کە دەبێت لە نووسینی زانستییدا پشتی پێ ببەسترێت.

ڕەچاوی خاڵبەندی ناکرێت و لە نووسینەکاندا خاڵ، وێرگوڵ، نیشانەی پرسیار و هتد لە شوێنی خۆیاندا نیین. هەندێک جار نووسەر هەر لە خۆوە دووان و سیان یان زیاتر نیشانەی پرسیار یان نیشانەی دیکە دادەنێت و پێی وایە بەو شێوەیە هێزی پرسیارەکەی خۆی زیاتر دەکات، یاخود ناو دەخاتە ناو کەوانەوە و خەت بە ژێر وشەدا دەهێنێت و وشە و ڕستە ڕەنگاوڕەنگ دەنووسێت. کەس نازانێت نووسەر ئەو پێڕەو و ڕێزمان و شێوەنووسینەی لە چ زمان و سیستەمێکی خوێندنی ئەم جیهانەوە هێناوە.

بێ لەوانە قسە و نووسینی کەسانی دیکە دەهێنرێنەوە بێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەکانیان بکرێت و نووسین و بیری کەسانی دیکە بێ ئەوەی ئاماژەی دروستیان پێ بکرێت دەدزرێن و لە نێو باسدا تێهەڵکێش دەکرێن.

بە کورتیی، نووسین لەسەر فێمێنیزم هەر وەک لەسەر شێوەکانی دیکەی ئایدیۆلۆژی و تیئۆری لە ناو کورددا، لە زۆر لاوە ناتەواوە و ئەو خۆماندووکردنەی تێدا نییە کە شایستەیەتی. هەندێک جار مرۆڤ وا هەست دەکات کە نووسەرێک زیاتر پەلەی لە بڵاوکردنەوەی خودی نووسینەکەیە وەک لە بیرەکەی خۆی.

سەرباری هەموو ئەم خاڵانە کە زیان لە جیددیەتی باسەکە دەدەن، هێشتا ئەو هەوڵەی کە دەدرێت جێگای ڕێز و پێزانینە و بێگومان کاریگەریی دروستی خۆی لەسەر بزووتنەوەی فێمێنیزم و شێوەکانی دیکەی ئازادیخوازیی دادەنێت.

تێگەیشتن لە فێمێنیزم دەتوانێت ڕێی تاریکی ژیان لە گەلێک لاوە ڕۆشن بکاتەوە. ئایا مافی باوکێک/ برایەک/ ئامۆزایەک کە ئافرەتێکی خۆیان دەکوژن لە کوێدایە؟ ئایا ئەوە نێرینەی خانەوادەیەکە کە بەرپرسە لەوەی کە پێی دەڵێن شەرەف؟ ئایا شەرەف چییە، لە کوێوە هاتووە، چەند و تا کوێ مانا و نرخی هەیە؟ ئایا شەرەف لە هەڵسوکەوتدایە یان لە بەینی ڕانەکاندا؟ ئایا تەنیا لە هی

ئافرەتاندایە یان هی پیاوانیشدا؟ کێ کۆدەکانی شەرەف و نامووس پێناسە دەکات، کێ لێکیان دەداتەوە و مانایان بۆ دادەنێت و کام لێکدانەوەیە مافی ڕەها بە خۆی دەدات؟ ئایا ئافرەتان لە ڕووی بایۆلۆژییەوە جیاوازن و لەبەرئەوەش دەبێت لە ڕووی مافیشەوە جیاواز بن؟ ئایا جیاوازیەکان کۆمەڵێک بەها و بۆچوونی کۆمەڵایەتی دروستیان دەکات دەنا خۆیان نیین؟ ئایا ئەو پێوەندیە کۆمەڵایەتییانە خۆیان دەستکردی نیزامێکی دەستەڵات و سیاسەتن و پیاوان لە پشتیانەوەیە یان هەر لە خۆوە لە دامێنی نەتەوەیەکەوە لە سرووشتەوە دەکەونە خوار؟ ئایا ئافرەت تەنیا لەبەر ئەوەی ئەندامی زاووزێی جودایە ئەوا ئەقڵ و هۆشمەندی و توانای بەرپرسیاریی کەمترە؟ ئایا بۆ ئەو جیاوازییە بە پێچەوانەوە نەبێت، بۆ پیاوان نەگرێتەوە؟ ئایا بۆ جودایی ئەندامی زاوزێی پیاوان نابێتە هۆی کەمبوونەوەی توانای ئەقڵ و هۆشمەندی و بەرپرسیارێتی پیاوان؟ کێ مانا بەو جیاوازییە دەدات؟ ئایا بۆ ئەو جیاوازییەی ئافرەتان لە نۆرمە[2] پیاوانەکەوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئافرەت جیاوازە لە بەراوورد لە گەڵ کێدا؟ ئایا بۆ ئایینەکانی وەک جوولەکە، کریستیانیزم، ئیسلام، بوودیزم و هی تر پڕن لە بۆچوونی جودای ناکۆک سەبارەت بە ئافرەت؟ ئایا جیاوازیی بایۆلۆژیی ئافرەتان شتێکە کە خوداوەندەکانیش دەبێت دەستی تێوەردەن یان مرۆڤەکان بە ناوی ئەوانە قسەیان کردووە و دەیکەن؟ بە چ شێوەیەک ئەو بۆچوون یان پێداگرتنە ئایینیانە وەربگیرێن، چۆن ڕەت بکرێنەوە، چۆن وەڵامیان بدرێتەوە؟ تا کوێ ئایین بۆی هەبێت دەست لە کاروباری مرۆڤەکان وەربدات؟ ئایا تەنیا دەست لە کاری ئافرەتان وەربدات یان هی پیاوانیش؟ ئایا وەک کارێکی پیاوان لە سیاسەت/ فەلسەفە/ ئایدیۆلۆژی تێبگەین یان وەک کارێکی مرۆڤ؟ ئەگەر کاری مرۆڤە کوا ڕۆڵی ئافرەتان، کوا بۆچوون و دەنگی ئەوان، کوا دەستەڵاتی سیاسی/ ئابووری ئەوان؟ ئایا کۆمەڵگا هی پیاوان و ئافرەتانە یان هی هەردووکیان؟ ئایا سنووربەندیی/ ماف/ ئەرک/ ئیمتیاز/ توانا/ فێربوون تەنیا ئافرەتان بگرێتەوە یان پیاوانیش؟ دەستەڵاتی سیاسیی چییە، چۆن پێناسە بکرێت، بۆ وا پێناسە بکرێت، لەو پێناسەیەدا چی و کێی تێدا بێت؟ ڕۆڵ و شوێنی و ئەرکی خێزان تا کوێ سیاسییە و لە کوێدا سیاسیی نییە، کێ ئەو بڕیارەی لە دەستدایە و بۆ چی لە دەستیدایە؟ ئایا ئەوەی لە ژووری نووستندا دژ بە ئافرەت ڕوو دەدات کەسیی و تایبەتیە و کۆمەڵگا نابێت لێی بەرپرسیار بێت؟ سنووری دەستتێوەردانی کۆمەڵگا/ دەوڵەت/ یاسا تا کوێ بێت و چۆن پیادە بکرێت؟ ئایا ڕەخنە تا چەند گشتگر بێت و

---

[2] نۆرم: پێوەر، عەیارە، چوارچێوە، قاڵب

لە کوێدا تایبەتی بێت؟ ئایا ڕێکخراوگەلی سیاسی لە کوردستان تا کوێ دەتوانن هەلومەرجی ئافرەتان باشتر بکەن و لە کوێدا ناتوانن بیکەن؟ ئایا ئێمە هەموو ڕیفۆرمێك بەخێربێنین یان تەنیا گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانە بە دروست بزانین؟

ئەمانە و زۆر پرسیاری دیکە کە دەکرێت بکرێن و کە دەبێت ئێستا و لە ئاییندەدا وەڵام بدرێنەوە. بەڵام مەحاڵە ئەو پرسیارانە وەڵام بدرێنەوە ئەگەر ئافرەتان خۆیان لە پرسیارکردنەکاندا بەشدار نەبن، ئەگەر ئەوان خۆیان لە وەڵامەکاندا بەشدار نەبن، ئەگەر ڕێگایان پێ نەدرێت بە پێی بۆچوون و تێگەیشتنی و جیهانبینی خۆیان بەشدار نەبن. بەڵام چۆن ئافرەتان بتوانن بەشدار بن گەر ڕێگایان پێ نەدرێت ئەو زانین و تێگەیشتنە وەدەستبهێنن کە بۆ ئەو پرسیار و وەڵامانە پێویستیانە؟

دیارە ئافرەتانێکی بەئەژمارد هەن کە بە دروستییەوە چاوەڕێی ئەوە نیین پیاوان بێن و ئەو مافەیان بدەنێ. خۆیان لە بەرەبەیانی مێژووەوە لە ئەشکەوتێک و خانووەیەک و بەلەمێکدا لەگەڵ پیاودا ژیاون، لە کێڵگەیەک و کارگەیەکدا لەگەڵ پیاودا کاریان کردووە. دەزانن پیاو کێیە، چی دەکات، چی کردووە و دەتوانێت چی بکات.

بەڵام ئافرەتان، هەروەک پیاوان، گرووپێکی هۆمۆژن، هاوڕا، هاودەنگ و هاوئاواز نیین. لە ناو ئافرەتانیشدا هێندەی پیاوان شێوەکانی ئایدیۆلۆژی، بیر، بۆچوون، ڕامان، تام و ڕووانگە هەن. بەڵام یەک خاڵی هاوبەش لە ناو ئافرەتاندا هەیە کە لە ناو پیاواندا نییە. ئەویش ئەوەیە کە لەبەرئەوەی ئافرەتان بەگشتی و تێکڕا وەک پۆل/ گرووپ/ لا ژێردەستەن، هەرە زۆربەیان خوازیاری گەیشتنە بە مافی بەرابەر، هاوئاست و هاوماف لە پێوەندی لەگەڵ پیاودا هاوکات کە هاوئەرکی پیاون. بەو جۆرە دەبینین کە ئافرەتان خاڵی هاوبەشی ئازادیخوازیی و ڕزگاریخوازییان هەیە.

ئەمە دەشێت مانایەکی فێمێنیزم بێت.

سەرباری هەبوونی ئایدیۆلۆژی و بۆچوونی سیاسی جیاواز ئافرەتان بەگشتی لەو ژێردەستەییە ماندوون کە پیاوانی خاوەن ئایدیالۆژی جیاواز بە ئارەزووی خۆیان لێکی دەدەنەوە، تەفسیری دەکەن، چارەی بۆ دەدۆزنەوە و پلانی بۆ دادەنێن. هەندێک پیاو پێیان وایە کە ئەوان لە ئافرەتان خۆیشیان باشتر لە دۆخی ئەوان، لە ئازاری ئەوان، لە خواست و ویست و هیوا و ئارەزووی ئەوان تێ دەگەن و لەبەر ئەوە دەشتوانن نوێنەرایەتیان بکەن.

ئەمە لایەنێکی دیکەی فێمێیزمە.

ئەگەرچی کە ماری وۆلستۆنکراف Mary wollstonecraft ساڵی ١٧٩٢ کتێبی "بۆ پاراستنی مافەکانی ئافرەت" ـ ی نووسی و کەسانی وەک ئۆلێمپە دی گۆگێ

Olympe de Couuges و تیۆریگنە دە مێریکۆرت Théroigne de Méricourt زۆر لە پێش بزووتنەوەی ڕێکخراوی ئافرەتانەوە لە سالانی ١٨٤٠ و ١٨٤٨، بۆ نموونە لە ئەمەریکا و ئینگلستان مەسەلەی ماف، ئەرک و هەلاواردنی ئافرەتانیان باس دەکرد، لەڕاستیدا لە نێوان ١٩٦٠ و ١٩٧٠ کاندا بوو کە ئافرەتان هێدی هێدی وشەی فێمێنیزمیان بەکار دەبرد.

ئەو کاتەش هێشتا هەر ئەو ناوە سەبارەت بە هەندێک پرس و گرووپی تایبەتی بوو کە لە کۆمەلگای ئورووپادا بۆ مافەکانی ئافرەتان تی دەکۆشان (فریدمان ٢٠٠٣). بەلام بەهەر حال، ئەوانەی کە هەر دەیانەویت وشەی "فێمێنیزم" وەک مۆرێک لەو جۆرە بزووتنەوە کۆمەلایەتی و سیاسیانەی کۆن بدەن، دەتوانن وا بکەن، ئەوە نەبێت کە دەبێت بە وردی خۆیان ڕوون بکەنەوە و خوێنەر لە مەبەستی خۆیان ئاگادار بکەن.

هەلبەتە فێمێنیزم زۆر شت دەگرێتەوە، یەکێک لەوان کە بە ڕای من خالێکی بنچینەییە، دەتوانێت ڕزگاربوون بێت، لەو ڕووانگە ئایینیەی کە ئافرەت بە پەراسوویەک و پیاو بە لەشە تەواوەکە دادەنێت، کە ئافرەت هەلخەلەتاوەکەیە و پیاویش قوربانیی دەستی هەلخەلەتاوەکەیە. تۆماسی ئەکینۆیی Thomas of Aquino توانی لەم دیدەوە ڕووانگەی ڕەسمی کلێسا بفۆرمێنێت و ئەو مەبەستی ئەوەیە کە ئافرەتان بۆ خۆیان باشە کە ژێردەستەی پیاوانن چونکە پیاوان خاوەن هۆشمەندیەکی باشترن. بەڕای ئەو ئافرەتان "گۆشتن" و پیاوان "ڕۆحن"[3].

لە وەلامدانەوەی ئەم جۆرە پێداگرتنە نەریتیانەدا کە بێگومان ڕۆلی کاریگەریان هەبووە کە ئافرەتان بخەنە ئەم دۆخە خراپەی ئێستایان کە تێیدان، فێمێنیستەکان بەزۆریی هاوڕا و هاوقسەن، بەلام بەئەژماردن ئەو فێمێنیستە ئەکادێمیانەی بە شێوەی جودا پێناسەی خودی فێمێنیزم دەکەن. زۆربایەتی ئەو پێناسانە زۆر ئایدیۆلۆژین، یەکلایەنەن و لە وردەکاریەکانیاندا ناکۆکیان تێدایە.

قسەکردن لەسەر فێمێنیزم ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە هەلە بێت، لەبەر ئەوەی کە فێمێنیزم بیر یان چەمکێکی هۆمۆژن نییە، بەلکو کۆمەلێک بیر و بۆچوون و ڕووانگەی جودایە، بێلە کۆمەلێک "کردار" و هەندێک جاریش نەک هەر جودا، بەلکو تەنانەت دژبەیەک و ناکۆکیش. لەبەرئەوە جێی خۆیەتی زیاتر وشەی فێمێنیزمەکان بەکار ببرێت. بەلام پێناسەی "فێمێنیزمەکان" کارێکی مەحالە و لەبەر ئەوە دەتوانین کارەکە بەو شێوەیە بۆ خۆمان هاسان بکەین کە خالگەلی

---

[3] Tusen svenska kvinnorår. Ann-Sofie Ohlander och Ulla-Britt Strömberg, Bokförlaget Prisma, andra upplagan. S. 118

هاوبەشی شێوەکانی فێمێنیزم کۆبکەینەوە و بناخە بنچینەیە گشتییەکەیان وەربگرین و بەو شێوەیە پێناسەیەکی گشتگری فێمێنیزم بکەین.

وەک جەین فریدمان Jane Freedman دەڵێت "دەتوانین لەو پێداگرتنەوە دەست پێ بکەین کە فێمێنیستەکان سەرنج دەخەنە سەر دۆخی بندەستەیی ئافرەتان لە کۆمەڵگادا و سەر ئەو هەڵاواردنەی لەبەر جنسەکەیان دووچاری دەبن. بێلەوەش مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە فێمێنیستەکان داوای گۆڕانکاریی لە نیزامە کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و کولتووریەکەدا دەکەن، بۆ ئەوەی کە بەرەنگاری ئەم هەڵاواردنە ببنەوە و لە بەردەوامییشدا نەی هێڵن"[4].

ئولڵا مانس Ulla Manns – یش هەر نێزیکەی بە هەمان شێوە پێناسەی فێمێنیزم دەکات و دەڵێت "لە وتارەکەمدا فێمێنیزم بە واتا بەربڵاوەکەی بەکار هاتووە، واتا وەک تێکۆشانێک بۆ کۆتایی پێهێنان بە ژێردەستەیی ئافرەتان"[5].

هەر سەبارەت بە هەمان باس بێل هووکس Bell Hook دەڵێت "گرفتێکی گەورەی گوتاری فێمێنیستی ئەوەیە کە نەمانتوانیوە بگەینە کۆدەنگیەکی (هاوڕاییەکی) ڕووانگەیی سەبارەت بەوەی کە فێمێنیزم چییە یان ئەوەی کە ئەو پێناسەگەلانە پەسەند بکەین کە دەشێت بتوانن وەک خاڵگەلێکی یەکخەر سوودیان هەبێت"[6]. ئەم بە کورتی فێمێنیزم بە "بزووتنەوەیەک بۆ کۆتایی پێهێنان بە چەوسانەوەی سێکسیی"[7] پێناسە دەکات. بێل هووکس بۆ نموونە، ئەو جیاوازیانە کە پلە و دۆخی کۆمەڵایەتی ئافرەتانی ڕەشپێست/ سپیپێست/ کرێکار/ هەژار/ زەنگین هەن زۆر بە گرینگ دەنرخێنێت و مەبەستی ئەوەیە کە گرینگە فێمێنیزم بتوانێت پرسیار و وەڵامی ئەوانە بگرێتە خۆی.

کەواتە سەبارەت بە ڕۆڵی پیاوان و بەشدارییان لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی ئافرەتاندا زۆرینەی فێمێنیستەکان لەسەر ئەوە یەکن کە پیاوانیش دەتوانن فێمێنیست بن، واتە لە تێکۆشانی ئافرەتاندا بەشدار بن کە بۆ نەهێشتنی بندەستەیی ئافرەتانە. دەربارەی ئەم خاڵە بێل هووکس دەڵێت "بەو شێوەیە فێمێنیست هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە خوازیاری نەهێشتنی پلەی نزمی ئافرەتانن لە کۆمەڵگادا. هەروەک لێکۆڵەرەوانی دیکە، منیش هیچ هۆیەک

---

[4] Feminism, Jane Freedman och Liber AB. Svenska översättning Karin Lindqvist, Wallin & Dalholm Boktryckeri AB, Lund 2003. S. 7.

[5] Än män då? Kön och feminism i Sverige under 150 år. Författerna och bokförlaget Atlas. Scandbook, Smedjebacken 2004. S.26.

[6] Feminisms, Oxford University Press 1997, Edited by Sandra Kemp and Judith Squires, (Bell Hooks) p. 22.

[7] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نابینم کە دەستەواژەی فێمێنیست تەنیا بۆ ئافرەتان بپارێزم. ڕۆڵی پیاوان هەروەها لە گۆڕەپانی ئەزموونیشدا (ئیمپیریکدا) جێی سەرنجە و گرینگە"[8].

فێمێنیزم هەر لەو ڕووانگەیەوە کە بزووتنەوەیەکی مرۆڤییە بە تەنیا مەسەلەی ئافرەت ناخاتە ژێر سەرنجەوە، ئەو بۆچوون و ڕووانگە جیاوازانەی ئەوان بێگومان پرسگەلی وەک نەتەوە، خەباتی ئازادیخوازیی، پرسی ئێتنیسێتی، زمان، فەرهەنگ، کولتوور و هەموو ئەو شتانەی دیکە دەگرێتەوە کە پێوەندی بە مرۆڤ، گرووپ و کۆمەڵگاوە هەیە. هەموو ئەمانەش لە ڕووانگەی جودای پۆستمۆدێرنیستی، مارکسیستی، سۆشیالدیموکراتی، ئەنارشیستی، ئێسێنسیالیستی و هەموو شێوەکانی دیکەی ڕێچکەی ئایدیۆلۆژی و بیرەوە تاووتوێ دەکرێن. هەندێک جار یەکگرتن لەسەر لێکدانەوەی گرفتێک و چارەسەرەکەیشی هاسانە، هەندێک جار جیاوازیەکی تەواو جودا و بە یەک تەریب لە لێکدانەوە، هۆکار و چارەسەرەکاندا هەن.

هەڵبەت زۆرینەی جۆرەکانی فێمێنیزم لە ئورووپا شیلگیرانە سەرتاسەری نیزامی دەستەڵاتی حوکمەتان و سەرمایەداریی جیهانیان خستووەتە ژێر پرسیارەوە، پرسەکانیان هەم تایبەتە بە یەک وڵات و هەم هاوکاتیش جیهانبینی و جیهانگیریەکی فراوانی تێدایە.

هەر لەو کارە کولتورییانەوە کە بە چاوی ساکار و ئاسایی وا دەبینرین کە بۆ ئافرەت بێ زەرەر بن، تا هونەری فیلمسازیی کە ژنان بە دەگمەن تیایدا ڕۆڵی دروستکەر و داهێنەریان هەیە، تا مەسەلەی خوێندن، کارگە، کار، فێرکردن، نەخۆشخانە و هتد. هیچ بوارێک نەماوە بە شێوەی جودا دەستی فێمێنیستەکانی نەگەیشتبێ.

بێگومان لەم بێنەو بەرەیەدا ناکۆکی و خۆدژگۆیی و ناتەباییەکی سیاسیی لە نێوان فێمێنیستاندا دروست دەبێت. مرۆڤ بە هاسانی دەتوانێت تێبگات کە دۆخەکە وایە و بە سادەش ببینێت، بەڵام گرفتی ئەو دۆخە ئەوەیە کە کێشەی سیاسی دروست دەکات. وەکو نموونە، هەندێک فێمێنیست، نائورووپی و ئورووپی، ڕەخنە لەو فێمێنیستانە دەگرن کە لە نۆرمی ئورووپا و ئورووپابوونەوە پێ هەڵدەگرن. ئەم جۆرە فێمێنیستانە پێیان وایە کە زۆربەی زۆری فێمێنیستانی ئورووپا هەمیشە لە نۆرمی ئافرەتێکی سپیپێستی ئورووپی و لە ژیانی ئورووپاوە هەنگاو دەنێن و بایەخ بەو جیاوازییە نایەن کە ئافرەتانی دیکە لە جیهاندا هەیانە و کە بێگومان گرینگن. بۆ نموونە فێمێنیستی ئەمەریکایی بە نەژاد عەرەب لەیلا ئەحمەد Leila Ahmed دەنووسێت کە "ئەجێندای فێمێنیستی بەو

---

[8] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شێوەیەی کە لەلایەن ئەوروپییەکانەوە پێناسە کراوە لە زۆر لاوە لە وردەکارییەکانیدا هەڵەیە، هەروەها لەو تێڕوانینەشیدا کە سەرنج دەخاتە سەر چارشێو"[9].

خوێنەر تێبینی بکات کە لەیلا ئەحمەد خۆیشی لێرەدا کەوتووەتە ئەو هەڵەیەوە کە بە گشتیکردنەوە generalize لە فێمێنیستانی ئەوروپا دەدوێت، هەروەک ئەوەی کە هەموو فێمێنیستانی ئورووپیی لە هەموو شتێکدا هاوهەڵوێست و هاوبیر بن.

لێرەدا بە ڕوونی دیارە کە لەیلا ئەحمەد کەوتووەتە ناو چەمکی ئورووپی/ خۆرهەڵاتی/ نائورووپییەوە کە هەندێک لە فێمێنیستانی دژەکۆلۆنیالیستی و پۆستکۆلۆنیالیستی هەیانە و کە لە ڕاستیشدا زۆربەیان هەر خۆیان ئورووپین.

بەو جۆرە ئافرەتان لەبەرئەوەی وەک مرۆڤ سپیپێست، ڕەشپێست، کاتۆلیک، موسڵمان، زەنگین، و هەژارن، لەبەر ئەوەی جودا دەڕواننە بیر و جیاوازیی چینایەتیی، ڕەگەزیی، دیدی ئازادی سێکس و تەمەنی یاسایی و یاسای نەنووسراوەی کولتوری و شتی دیکەی گرینگی لەو بابەتە ئەوا لە قوڵایی لێکدانەوەکانیاندا بێگومان دەکەونە ناکۆکی گەورەوە، لەلایەکەوە لەگەڵ بیری خۆیاندا و لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ جۆرەکانی دیکەی بیری فێمێنیسیدا.

بە ڕەچاوکردنی ئەم دۆخە جیهانییەی فێمێنیزمی تێدایە دەتوانین بڵێین وا تێگەیشتن کە ئافرەتانی کوردستان دەتوانن یەکدەنگ و یەکڕەنگ بن بەلانی کەمەوە لە درێژخایاندا هەڵە دەبێت. هەروەها ئەوەش هەر هەڵەیە کە چاوەڕوانیی گەورەی وا لە ئافرەتانی کوردستان بکرێت کە بتوانن بە ماوەیەکی کەم کاریگەریی بەرچاویان لە هەموو پرسەکاندا لەسەر حوکمەتی کوردستان، ڕێکخراو و پارتە سیاسیەکان، بزووتنەوە ئایینیەکان و مزگەوتەکان هەبێت.

سەرباری ئەمە ئەو هەنگاوە گرینگە کە خەباتێکی ئێستایی و ئاییندەیی پێکەوە ببەسترێنەوە. هەندێك دەستکەوت ئەمڕۆ وەدەست دەهێنرێن و هەندێکی دیکە دەبێت زەمینە و هەلومەرجیان بۆ بڕەخسێندرێت. ئەوە پرۆژەیەکە کە کات، زانیین، زانیاری، دامودەستگا، دامەزراوە، پلان، ستراتیژیی، وردبینی و وەك ئەوانەش گرینگ پارەی پێویستە. بەڵام بێگومان ئامانج دەبێت یەکخستنی دەنگ و ڕەنگە جیاوازەکانی ئافرەتانی کوردستان بێت، گۆڕینی کۆمەڵگا بێت وا کە

---

[9] Women Gender in Islam. Leila Ahmed, Yale University. 1992. p.166.

ئەم کتێبەی لەیلا ئەحمەد کە تێڕوانینێکی تایبەتییە لەسەر دۆخی ئافرەتان لە جیهانی ئیسلام بە زۆر وردەکاریی سەرنج ڕاکێشەوە، جێی خۆیەتی بخوێندرێتەوە. بەشێکی کتێبەکە ڕەخنەی زانستیانەی وردە لەسەر ئیسلام .

باشبوونی بەرچاو بە خۆیەوە ببینێت، مسۆگەرکردنی یاسا و ڕێسا و ئەو جۆرە گەرانتیانە بێت کە نیگەرانی ئافرەتان کەم دەکەنەوە. بەو شێوەیە بە ڕای من خەباتی ئافرەتان بۆ وەدەستهێنانی مافەکانیان خەباتێکی بەردەوام و درێژخایەنە و لەبەرئەوەش تۆلەرانسی سیاسی و تێگەیشتنی سیاسی، قووڵبوونەوەی سیاسی/ ئایدیۆلۆژی/ بیری دەخوازێت و پێویستی بە ئافرەتانی هۆشمەند هەیە کە دەتوانن لەو شوێنە بن کە دەبێت لێی بن و کە گەرماوگەرم و لە جێی خۆیدا خێرا بیر بکەنەوە.

باسەکە لەوە زیاتری دەوێت کە لێرەدا باس بکرێت. دەرفەتی دیکە بێگومان دەبن کە ئەو کارە بکەین. بەڵام دەمەوێت وەک سەرئەنجام وەرگرتن بڵێم کە ئافرەتان دەبێت هەمان ئەو مافانەیان هەبێت، هاوکات کە هاوئەرکن، کە پیاوان هەیانە.

من پێموایە دروشمی فێمێنیستە ڕادیکالەکان لەوێدا کە داوای "نیوەی دەستەڵات و هەمان و تەواوی مووچەش وەک هی پیاو"* دەکەن، دروشمێکی باشی ئاییندەییە کە لە ئێستاوە کاری بۆ بکرێت. تا ئەو دەمە، هەرچییەک کە بتوانرێت بۆ کەمکردنەوە و نەهێشتنی هەلاواردنی سیاسیی، بەرزکردنەوەی ڕادەی تەندروستیی، خوێندن، توانا، هۆشمەندیی ئافرەتان بکرێت، جێی خۆیەتی و ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە بە دەستوبرد ئەنجام بدرێت.

ئەمە لایەنێکی گرینگی دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنییە.

سەرچاوەکان:

1. Feminism, Jane Freedman och Liber AB. Svenska översättning Karin Lindqvist, Wallin & Dalholm Boktryckeri AB, Lund 2003.

2. Än män då? Kön och feminism i Sverige under 150 år. Författerna och bokförlaget Atlas. Scandbook, Smedjebacken 2004.

3. Women Gender in Islam. Leila Ahmed, Yale University. 1992

4. Feminisms, Oxford University Press 1997, Edited by Sandra Kemp and Judith Squires.

5. Tusen flickor om film och våld. (red) Karin stigbrand och Sofie Stolpe. Skildringsrådet nr 23.

6. Tusen svenska kvinnorår. Ann-Sofie Ohlander och Ulla-Britt Strömberg, Bokförlaget Prisma, 2004 andra upplagan

* دروشمی ڕادیکال فێمێنیستەکان

ڕێبوار ڕەشید
٢٠٠٥/٣/٨

ئەو شتەی كە هێزی گوڕ و ئامادەیی بەرەنگاربوونەوەی جیددی بە فێمێنیزم دەدات بێگومان ئەم نیشاندانەی ناكۆكیەكانی ناو ئەو بوارانەیە كە بە بەردەوامی نكۆڵییان لێ دەكرێت.
جان سكۆت Joan Scott

# پێشەکی

فێمێنیزم لەو چەند دەیەی دواییدا کۆمەکێکی زۆری ڕادیکال و خۆشدیدەی بە تیئۆری سیاسی کردوە. فێمێنیزم ئەو بیرە بنچینەییانە دەتوێژێتەوە، دەخاتە ژێر ڕەخنە و فۆرمولە دەکاتەوە کە هەم سیاسەت و هەم زانستی سیاسەتیش لەسەریان دامەزراون. تیئۆری فێمێنیستیی هەم سەرلەنوێ چەمکی کلاسیکیی سیاسی بە شێوەیەکی بەرەنگار لێک دەداتەوە و هەم ئەو بوارە بەسیاسەتکراوانەش کە بە نەریت بە سیاسی دانانرێن، بۆ نموونە وەک خێزان، لەش، زانست و زمان.

کتێبی *"ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت"* خوێنەر بەو پرۆژە نوێ دەستپێشکارە ئاشنا دەکات کە تیئۆری مۆدێرنی فێمێنیستیی دەیگرێتە خۆی. ئێمە سیاسەت دەخەینە ناوەندی ڕامانەوە و بەردی بناخەی ئەم خوێندنەوەیەشمان پێوەندی نێوان دەستەڵات و جنسە.

مەبەستی ئێمە نە خوێندنەوەیەکی ئایدیالیستیانەی مێژووی سەرهەڵدان و بیری گەشەی فێمێنیزمە و نە تێڕامانێکی تەواوی تیئۆری فێمێنیستییە. لەبری پۆلێنکردنی فێمێنیستەکان بە پێی خەسڵەتی داڕێژراو و باو، وامان هەڵبژاردووە کە هەندێک بەشەگرفت بخەینە ڕوو کە لە تیئۆری فێمێنیستییدا ناوەندیین (گرینگن). بەشەگرفتێک لەسەر ئەوەیە کە چۆن جیاوازی جنس کۆمەڵایەتیانە دامەزێنراوە و جنس چ واتایەک دەگەیەنێت. ئێمە وەک پۆلێکی شیکردنەوە لە شێوەی جودای تێگەیشتنی واتای جنس و لە پێوەندی نێوان چەمکەکانی جنس، تاکەکەس و چین دەڕوانین. ئێمە هەروەها گۆتۆبێژی فێمێنیستیی لەسەر چەمکی سیاسیی کلاسیکیی وەک هاووڵاتێتی و دیموکراسی خستووەتە ناو ئەم خوێندنەوەیەمان. بێ لەوانەش مامەڵە لەگەڵ سەرنج و کاردانەوەی فێمێنیستی لەسەر تیئۆری زانستیانە دەکەین.

تێکستەکەمان دوو مەبەستی هەیە. لە لایەکەوە دەمانەوێت نیشانی بدەین کە فێمینیزم و تیئۆری سیاسی کلاسیکیی چ جۆرە پێوەندیەکیان پێکەوە هەیە، لەلایەکی ترەوە تیئۆری فێمینیستیی بەو شێوەمەرجەی خۆی کە هەیە بخەینە بەردەست. ناکرێت فێمینیزم تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ نەریتدا ببینرێت، بەڵکو جێی خۆیەتی وەک پرۆژەیەکی تیئۆری خۆیی ببینرێت کە تیایدا پرسیارگەل و گرفتی زانستیی بە تەواوی لە ناو خۆیەوە سەرچاوە بگرن. ئەو خاڵی ڕامانانە کە ئێمە مەبەستمانە پێویستن بۆ ئەوەی بتوانرێت لە ڕیئالیزمی ئەو جیهانە

کۆمەڵایەتیە تێبگەیرێت کە تیایدا تا ئێستاش جنسی ئافرەتان دەکرێت بە کەمئەندامیەکی سیاسیی و لەشیشیان دەکرێت بە بیانووی بندەستییەکەیان.
گەلێک توێژەرەوە، خوێندکار، دۆکتۆراند و هاوڕێ لە کاری ئەم کتێبەمداندا یارمەتیان داوین. ئێمە دەمانەوێت بە تایبەتی سوپاسی ئێڤا کریستۆنسۆن Eva Christensson، مۆد ئێدواردس Maud Eduards، وینتۆن هیگینس Winton Higgins، ئیڤۆن هیردمان Yvonne Hirdman، ماتیاس هۆیەر Mattias Höjer، ماریا یانسۆن Maria Jansson، نیللی کۆپۆلا Nelli Kopola، ئولف مۆرکێنستام Ulf Mörkenstam، مالین ڕۆنبلوم Malin Rönnblom و پێتەر ستراندبرینک Peter Strandbrink بکەین، هەروەهاش سوپاسی ئینیستیتیوتی زانستی سیاسیی لە زانکۆی ستۆکهۆڵم و لە Arbetslivsinstitutes kvinnoforskningsseminarium دەکەین.

ستۆکهۆڵم مانگی یەکی ١٩٩٦
ماریا ڤێندت هۆیەر Maria Wendt Höjer سیسیلیا ئۆسە Cecilia Åse

پێشەکی چاپی دووەم
چاپی دووەمی "ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت" کاری لەسەرکردراوە و درێژترکراوەتەوە. لێکدانەوە و دەلیلهێنانەوە تیئۆریەکان لەسەر سێکسیوالیتی و دەوڵەت سەردەمیی کردراون. بێلەوەش تێگەیشتنی تیئۆری زانستیی فێمێنیستی بەرفراوان و قووڵ کراوەتەوە.

ستۆکهۆڵم مانگی یەکی ١٩٩٩
ماریا ڤێندت هۆیەر Maria Wendt Höjer سیسیلیا ئۆسە Cecilia Åse

## ١
## سەرەتا

**بمانەوێت یان نا جنس شتێکە کە هەیە.** ئێمەی مرۆڤ وەک ئافرەت و پیاو دەژین و هەین جا چ لە ماڵەوە بین یان لەسەر کار یاخود خەریکی کاری سیاسیی پارتایەتیی بین. ئەو ڕاستییەی کە ئێمە بە هەرحاڵ نێرینەین یان مێینە، کە جۆرێك جنسمان هەیە، ڕەنگ لەسەر هەموو لایەنێکی کۆمەڵایەتی و خێزانیی دەداتەوە. بەڵام کاتێک فێمێنیستەکان پێ لەسەر ئەم خاڵە دادەگرن لە پێوەندی لەگەڵ تیئۆری سیاسی و پراکتیکی سیاسیدا ناکۆکیەک (پارادۆکسێک[10]) قوت دەبێتەوە. ئەمەش وا دەکات کە فێمینیستەکان بە بەردەوامی ناچار دەکرێن پێ لەسەر ڕاستییەک دابگرن کە لە سیاسەتدا نەبێت لە هیچ شوێنێکی تر نکوڵی لێ ناکرێت، ئەویش ئەوەیە، وەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، کە جنس هەم هەیە و هەم لە بواری جیاوازی ژیاندا دەوری خۆی دەبینێت.

تیئۆری سیاسی فێمێنیستیی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە جنس شتێک نییە ئێمە بە مەیلی خۆمان وەلای بنێین. ئەمەش لە پراکتیکی سیاسیدا چارەنووس سازە، بەو مانایەی کە جنس توانای ئێمە بۆ چالاکی و گۆڕانکاری سیاسی دیاری دەکات. لە ئاستی تیئۆرییشدا هەر بە هەمان شێوە توانای ئێمە بۆ تێگەیشتن لە سیاسەت سنووردار دەکات.

خاڵێکی دیکەی تیئۆری فێمێنیستی ئەوەیە کە ئافرەتان وەک گرووپ دەستەڵاتی سیاسی کەمتر و دەستڕۆیی کەمتریان لە پیاوان هەیە. ئەمەش ڕاستیەکە کە لەلایەن فێمێنیستانەوە بە شێوەی جیاواز ناوزەند کراوە؛ بۆ نموونە پیاوسالاریی (پەیترپارک)[11]، سیستەمی جنس یان نیزامی دەستەڵاتداریی جنسیی. سەرباری ئەوەی هەر ناوێکی لێبنرێت، فێمێنیستان هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە لەم سیستەمەدا ئافرەت بە شێوەیەکی سیستەماتیک بندەستە. هەرچۆنێک تێی بڕوانین سەبارەت بە بوونی نیزامێکە، سیستەمێک کە پێوەندیەکی هەرەمی لە نێوان ژن و پیاودا ڕا دەگرێت؛ واتە باڵادەستیی پیاو و بندەستیی ژن.

ئەگەرچی کرۆکی ئەم نیزامە ئەوەیە کە ژن و پیاو لە ئاست هەل پێدان و مافدا یەکسان نیین، کەچی هێشتا سیستەمی سیاسی لەسەر ئەو تێڕوانینە دامەزراوە کە گوایە هاووڵاتیان وەک هاودەستەلات و وەک تاکەکەسی بێجنس

---

[10] پارادۆکس: ناکۆکی، دژگۆیی

[11] من پێموایە دەبێت ئاگامان لێ بێت لە چ کاتێکدا جیاوازی لە نێوان دەستەواژەی "پیاوسالاری" و "باوکسالاری" دا هەیە. باوکسالاری زیاتر دۆخی بندەستەیی ئافرەت دەبەستێتەوە بە خانەوادەوە. تەنانەت ئەگەر باوک لە ئارایشدا نەبێت، برایەک یان ئامۆزایەکی تەمەن بچووکیش دەتوانێت ئەو نەزمی باوکسالارییە ڕابگرێت.

sexless بەشداری لە سیاسەتدا دەكەن. بە پێچەوانەی بۆ نموونە ئەتنیسیتی (عیرق)، مووچە و شێوەی پیشەداریی، ئەوا جنس بە پۆلێنێكی سیاسی ڕەوا دانانرێت.

بە كورت و كرمانجی ئەو ناكۆكیەی (دژگۆییەی) كە لە تیئۆری سیاسی فێمێنیستییدا بەردەوام پێی لەسەر دادەگیرێت ئەمەیە: *لە كاتێكدا كە هۆی كەمدەستەڵاتی ئافرەتان هۆكارەكەی ئەوەیە كە ژنن، لە سیاسەتدا هەم لە تیئۆری و هەم لە پراكتیكیشدا، جنس وەك پۆلێنێكی ڕەوا ددانی پیادا نانرێت.*

بە پێی ئەو پاشخانە دەشێت بڵێین كە ڕەخنەی فێمێبیستی دوو شێوەیە. لە لایەكەوە ئەوەیە كە چۆن لە تیئۆری سیاسی نەریتییدا جنس بنەمای دابەشكردنی دەستەڵات پێك دێنێت، و لە لایەكی دیكەوە ئاماژەكردن بەوەی كە لە توێژینەوەی سیاسیدا بۆچوونێكی باو هەیە كە دەڵێت گوایە جنس ڕۆڵێكی ئەوتۆی لە سیاسەتدا نییە. پێوەندی نێوان جنس و دەستەڵات لە هەردوو پراكتیكی سیاسی و تیئۆری سیاسیدا پشتگوێ دەخردرێت. بە واتایەكی دیكە پێوەندیەكی شووم لە نێوان سیاسەت و توێژینەوەی لە مەڕ سیاسەتدا هەیە. بە هەمان شێوە كە جنس لە ناو ڕۆژەڤی سیاسیدا وەلادەنرێت لەبەرئەوەی كە گوایە سیاسەتی 'دروست" نییە، بە هەمان شێوەش زانستیبوونی ڕەخنەی فێمێنیستی كە جنس دەهێنێتە ژێر پرسیار بە ئەنقەست لادەبرێت، چونكە گوایە لە ڕیزی زانستی "دروست" دا نییە. بەو جۆرە هیچ سنوورێكی ڕوون و دیار لە نێوان سیاسەت و زانستی سیاسەتدا نییە. 'زانستی' سیاسەت خۆی لە خۆیدا سیاسییە.

ئەمە بێگومان هەروەها تیئۆری سیاسی فێمێنیستییش دەگرێتەوە. سەركانی فێمێنیزم پرۆژەیەكی سیاسییە كە تیایدا ئافرەتان خۆیان ڕێكخست و داوای دەستەڵات و دەستڕۆیوی زیاتریان كرد. ئەگەرچی فێمێنیزم زیاتر پێشخراوە وا كە تەنانەت ببێت بە پرۆژەیەكی تیئۆری و ئەكادیمیش، بەڵام ئەو پێوەندییەی كە لە سەرەتاوە لە نێوان تیئۆری و پراكتیكی سیاسییدا هەبوو هەر ڕاگیردراوە. تەنانەت لەو پەڕی ئاستی تیئۆریی خۆیدا ئامانجی فێمێنیزم ئەوەیە كە پیاوسالاریی هەم وەك بیر و هەم وەك نیزام بگۆڕێت. لەم پێوەندیەدا بیریاری فێمێنیستی ماری هاوكسۆرت Mary Hawkesworth دەنووسێت كە "تیئۆری فێمێنیستی بە شێوەیەكی پتەو گرێدراوی پرۆژەیەكە كە ئامانجی گۆڕینی نیزامی پیاوسالارانەی كۆمەڵگایە" (1990:13).

بەم جۆرە بیری فێمێنیزم گۆڕینی هەلومەرجگەلی ئافرەتان و كۆتاییهێنانە بە چەوساندنەوەیان. دیوی دیكەی ئەم پرۆژەیە، واتە لایەنە تیئۆریەكەی، خاوەن ئەو باوەڕەیە كە دەتوانرێت پێوەندی نێوان ژن و پیاو بگۆڕدرێت. بەم شێوەیە فێمێنیزم هەمیشە لە نێوان دوو جەمسەردا دێت و دەچێت، لە لایەكەوە لە نێوان

ئایندەبینی و پراگماتیزمدا[12]، لە لایەكی دیكەوە لە نێوان بەرنامەیەكی تەواو تیئۆریانە و لە لایەكی دیكەوە كۆمەڵە داواكارییەكی واقیعی سیاسی ڕۆژانەدا.

فێمێنیزم ئەوە ئاشكرا دەكات كە چۆن پیاو لە واقیعی سیاسی و لەو مۆدێلە بیرانەی كە تیئۆری سیاسی بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم واقیعە بەكاریان دەبات كراوە بە نۆرم. مێژووزانی ناوداری سویدی ئیڤۆن هیردمان Hirdman Yvonne دەنووسێت كە "پیاو" بە ناوی مرۆڤەوە جیهانێكی پێكهێناوە كە بنەما فكریەكەی ئەم جیهانە و دامەزراوەكانی ناوی مەحاڵە كاریان تێ بكرێت". (1990:78)

لێرەدا دەبینین كە پیاو وەك نۆرم بە شێوەی جودا خۆی دەنوێنێت. وەك نموونەیەكی ڕوون دەتوانین باسی ئەو دیاردانەی ناو زمانی ڕۆژانەمان بكەین. بۆ نموونە دەگوترێت میراتی پاشایەتی كاتێك میراتگر پیاو بێت، بەڵام دەگوترێت میراتی پاشایەتی ژنانە كاتێك میراتگر ئافرەت بێت. هەر بەو شێوەیە سیاسەتمەدار و سیاسەتمەداری ژن. لێتوێژینەوە و لێتوێژینەوەی ئافرەتانیی، تیپی موزیك و تیپی موزیكی كچانە، پارتی سیاسی هەن و كۆمەڵەی سیاسی ژنانە هەن، هەروەك چۆن فوتبۆڵ و فوتبۆڵی ژنانە، نەخۆشی و نەخۆشیی ژنانە هەن.

كە پیاو نۆرمە بەو واتایە دێت كە پیاو بە بەردەوامیی وەك كەسی گشتیی ناو دەبرێت، هاوكات كە ئافرەت وەك شتە تایبەتەكە دەبینرێت، ئەوی كە جیاواز و لادەرە. واتە پیاو گشتیی و بێجنس دەبێت و وا پێدەچێت كە هەر ئافرەت خاوەن جنس بێت.

لە تیئۆری سیاسەتدا چەمكگەلێك وەك "هاووڵاتیی" و "تاكەكەس" هەر بە هەمان شێوە بە پێی پیاو شێوەی پێدراوە. كە مێژووی ئەقڵی سیاسی idéhistoria بە بەربڵاوی مێژوویەكە كە هی پیاوانە و سەبارەت بە ئەوانە و بۆ ئەوانە، نەیتوانیوە لە كارتێكردنی سەر چۆنیەتی شێوەگرتنی تیئۆریگەل و چەمكی سیاسی بنچینەیی دوور بێت. ڕووانگەی مێژوویی سەبارەت بە ئافرەتان و ئافرەتێتی ناكرێت وەك ئاخافتنگەلێكی لێرە و لەوێی سێكسیی یان وەك سەرئەنجامێكی (یەكجار دوورودرێژی) زنجیرەیی بارودۆخی خراپ ڕوون بكرێتەوە و وەلا بنرێت. بە پێچەوانەوە، ڕووانگەكانی سەبارەت بە جنس، سەبارەت بە ڕۆڵی جودای پیاوان و ئافرەتان و كرداری ئەوان لە كۆمەڵگا و دەوڵەتدا، ئاوێتەی مێژووی بیرگەلی سیاسی بووە.

لە تیئۆری سیاسیی كلاسیكدا سیاسەت و كەشی (سفار) سیاسی پێچەوانە لە بەرانبەر ئافرەتان و ئەوەی كە بە ئافرەتانیی دەناسرێت، دادەنرێت. گەلێك

---

[12] پراگماتیزم لێرەدا مەبەست لەوەیە كە ئەگەرچی بەرنامەی زۆر ڕادیكالیش هەبێت مرۆڤ لە پراكتیكدا ناچارە ڕەچاوی ئەو بارودۆخە بكات كە هاوسەنگیە سیاسیەكە دروست دەكات.

فیمێنیست بۆچوونیان وایە کە ئەمە لەسەر بنەمای هەبوونی بەروئاوەژووی (دایکاتەمیی) ناو دیدی خۆرئاوایی دانراوە، واتە جووتی دژ بەیەک.

> بونیاتی فەلسەفەی سیاسی و ڕووانگەکانی ئێمە لەمەڕ سرووشتی مرۆڤ بە ڕیزێک دیاردەی بەرئاوەژووی سێکسەوە بەندە کە دەستی لە دروستکردنی جیاوازیەکانی جنسدا هەیە. بەم پێیە ئێمە ئەقڵ لەبەرانبەر سۆز، کارا لە بەرانبەر ناکارا، کولتور لە بەرانبەر سرووشت و گشتیی سیاسەت لە بەرانبەر تایبەتییدا (ماڵەوەدا) دادەمەزرێنین. (Fee1983:11f).

جێنێڤیڤە لیۆید (١٩٨٤) Genevieve Lioyd باس لەوە دەکات کە چۆن زانست (مەعریفە) لە جیهانی ئەنتیکەوە وا بینراوە کە لەسەر دایکاتەمی (دیاردەی بەروئاوەژوو) دامەزراوە، وەک ڕاست/ چەپ، ڕووناک/ تاریک، دۆن (ڕۆح)/جەستە، شێوە/ بێشێوەیی، بزواندن/وەستان، ئەقڵ/ هەست. هەموو یەکێکیش لەم دژانە جنیسان تێ ئاخنراوە. لێرەدا یەکەم، ئەوی کە بە سەردەست و پۆزەتیڤ دادەنرێت و چەمکی هەر دایکاتەمیەکی ئیمتیازدارە بە پیاوانە دەبینرێت، هاوکات دووهەم دانە، ئەوی بندەستەکە، بە ئافرەتانیی دادەنرێت. بە پێی ئەفلاتوون ئافرەتان لە پیاوان زیاتر لە بێئەقڵی نێزیکن. ئافرەتان هەروەها لە لەش و لە گۆشت نێزیکترن. زانینی دروست و ڕاسیونال (ئەقڵیانە) تەنیا ئەو کاتە مومکینە کە بتوانین بەسەر ئەوی پێوەست بە لەشە بە تەواوی زاڵ بین. لێرەدا ئافرەت – بە هۆی خراپی ئەو بارە نالەبارەیەوە – لە بەرانبەر پیاودا کەمئەندامیەکی گەورەی هەیە. پیاوانی کلێسا هەر بەوە ڕازی نین کە ئافرەت وەک کەمئەندامێک دەبینن، بەڵکو کەسیان هەیە وەک تۆماس ئەکیوناس کە ئافرەت وەک خەوشدار و شێتوێت، و وەک لەلایەن سرووشتەوە بندەستەی پیاو، دەبینێت، "چونکە پیاو هەر خۆی بە تەنیا خاوەنی ئەقڵە" (quo. Eriksson & Bergenhiem 1995:107).

پاشتر لە مێژوودا، لە ١٨٠٠کاندا، ژان ژاک رۆسۆ Jacques RousseauJean باس لەوە دەکات کە شوێنی ژنان لە ناو دەوڵەتی ڕەوادا دروست ئەوەیە کە لێوەی دووربن. گەر ئافرەتان بۆیان هەبێت لە چالاکیی سیاسیدا بەشداربن لە بەینی دەبەن. هەر خودی هەبوونی ئافرەتان لە دەوڵەتدا دەبێتە مایەی لادان لە هەموو بیرێکی پرنسیپی گشتیی و ئەبستراکتی کە پێویستە لە دەوڵەتدا برەویان هەبێت. بێ لەوەش بەشداربوونی ئافرەتان لە سیاسەتدا دروست دەبێتە هۆی تێکدانی مێینەیی، هاوهەستیی سرووشتی و پەرۆشی ئەوان. بەو شێوەیە ئافرەتان هەم خۆیشیان و هەم کەشە سیاسییەکەش، بەوە دەدۆڕێن کە ئافرەتان بوار بدرێن بەشداری سیاسەت بن. (Coole ١٩٩٣)

وێندی براون (Wendy Brown ١٩٨٨) پێی وایە کە سیاسەت و پیاوانەبوون لە ناو پێوەندیەکی گیانی بەگیانی هاوبەشدا (symbiotic) سەریان هەڵداوە. ئەمەش شتێکە کە کاتی خۆی هەر ئەوسا ئەرستۆی فەیلەسوف لە زەمانی خۆیدا باسی کردووە، ئەریستۆ پێی وایە سیاسەت ئاستی مرۆڤ دەباتە سەرووی ئاستی ئاژەڵەوە. یەکەم جار مرۆڤ لە سیاسەتدا بە ئازادیی دەگات، کاتێک کە لە ڕێگای ڕەفتاری سیاسیەوە خۆی لە حەز و پێداویستییە فیزیکیە سەرەتاییەکانی ڕزگار دەکات. بەو شێوەیە پێشمەرجی ئازادی ڕاستەقینە خۆئازادکردنە لە جەستە، خۆئازادکردنە لە مەژغوڵیی ژیان و پێداویستییەکانی ژیان. ئەمەش بەشداربوونی ئافرەت لە پرۆسە سیاسیەکاندا دەردەهاوێژێت. لەشی سکپڕ، واتە ئافرەتی دووگیان، زۆر بە ئاشکرا وەسفی پرۆسەیەک دەکات کە نەدەشاردرێتەوە و نەکۆنتڕۆڵ دەرکرێت. بەو جۆرە ئافرەت دەبێت بە هاوواتا بۆ سرووشتێکی کێوی و بۆ ئەو شتەی کە لە ڕامکردن نایەت.

> ئافرەت لەڕووی مێژووییەوە بە یەکێک لە هەرە شتە نالەبار و شێوێنەرەکان دادەنرێت کە بهێنرێتە ناو سیاسەتەوە: دروست لەبەرئەوەی کە ئافرەت بۆ ڕاگرتنی لەش، سێکس و هێشتنەوەی ژیان پێناسە کراوە، ئەوا لە گۆڕەپانی سیاسیدا، تا ئەو ئاستەی وا دەبینرێت کە بە کالآ قەدەخەکانی خۆی سیاسەت پۆخڵ دەکات، سڵی لێ دەکرێتەوە. (Brown 1988:194f)

لەملاشەوە، پیاو بە نیزامێکی ئەقڵبەخش و هۆکاری ڕەوشتیی دەبینرێت. پیاوبوون بە واتای کۆنتڕۆڵکردنی بایۆلۆژیی، ستروکتوردان، ئاراستە و واتابەخش بە گەڕی حەتمیی ژیان دێت. سیاسەت دەبێت بە هاوواتای پیاوێتی، کە دەستەڵاتی بە سەر جەستە و پێداویستیەکاندا دەشکێت، کە کۆنتڕۆڵی بە سەر خودی ژیان خۆیدا هەیە. (Brown1988:180f)

کە ژنان بە لەش، بە بێئەقڵی و بە نا ـ سیاسییەوە گرێ دەدرێن ڕەهەندێکی گرینگی مێژووی بیری سیاسییە. ئافرەتان و کەشی گشتیی (دەوڵەتیی) Public Sphere لە دەمێکی درێژدا وەک دژبەرییەک دەبینران. کاتێک ئافرەتان لە کۆتایی سەدەی بیستدا داوایان کرد کە لە سیاسەتدا بەشداربن بە شێوەیەکی سەیر لە ئافرەتبوونی "دروستی" خۆیان کەوتن. ئەو ئافرەتانەی کە داواخوازی مافی دەنگدان بوون بە "خەساو ـ بێ زێ" و بە "دەعبا" ناو دەبران، "ئافرەتانی ڕەسمی" هەر کورت و هاسان ناوێکی تر بوو کە لە جیاتی وشەی سۆزانیی بەکار دەبرا. (Johanisson 1994:67)

ئافرەتان بە بەردەوامیی لە هەموو شتێک کە بە سیاسەت دەناسرێت دەرهاویێژتراون و لە هەموو ئەو بەشانەی ژیاندا کە بە ئافرەتەوە پێوەندن وەک پێچەوانەی جەمسەری سیاسەت بینراون.

بەڵام لە زانستی سیاسەتی مۆدێرندا ئەو کەسە نموونەییەی لەوەبەر کە بە پیاو درابوو گۆڕدراوە بە بیچمێکی تەواو سەیر. لێرەدا پیاو کراوە بە کەسێکی ئەبستراکت، بە "تاکەکەسێک"ی بێجنسی جەستەنەدار یان بە "هاووڵاتی". لە زانستی سیاسەتی هەنووکەدا هەندێک جار هێندە زێدەڕۆیی لە بەکاربردنی ئەم چەمکە بێجەستەییەی پیاودا دەکرێت کە گۆتوبێژە زانستیەکە هیچ پێوەندیەکی بە مرۆڤەوە نامێنێت. لەبری ئەوەی باسەکە لەسەر مرۆڤ بێت، ئەوا باسەکە، هەر وەک لە پێناسە بە ناوبانگەی پرۆفیسۆری زانستی سیاسەت ڕۆبەرت داڵ Robert Dahl یشدا کە لەمەڕ دەستەڵات کردوویەتی، کراوە بە باسی ئەلف و بێ. لەوێدا ڕۆبەرت داڵ فەلسەفە دەکات و دەڵێت: بیرەبۆهاتووەکەی من ئەوەیە کە A دەستەڵاتی بە سەر B دا تا ئەو جێگایە هەیە کە A لە دەستی دێت کارێک بە B بکات کە دەنا B وەکی تر نایکات. (1956:13)

دیارە فێمێنیستەکان لەم جۆرە تیئۆریانە بە ڕەخنەن کە هەر لە خودی گریمانە سەرەتاییەکەیانەوە جنس لە باسەکەیان دەردەهاوێژن. کاتێک کە جنس دەسڕدرێتەوە ئەوا مرۆڤ هەموو تواناکارییەکی لە کیس دەچێت کە ببینێت چۆن جنس و دەستەڵات پێکەوە بەستراون. یاری پیت پیتێنەکەی پرۆفیسۆر ڕۆبەرت داڵ لەم بوارەدا نموونەیەکی بەر چاوە. لە لایەکی دیکەوە بیریارانی (تیئۆریسیەنی) دیکە هەن جنس لەو ڕێگایەوە دەشارنەوە کە لە باسەکانیاندا باس لە هاووڵاتییەکی گشتیی دەکەن کە هەم ئافرەتان دەگرێتەوە و هەم پیاوانیش. لێرەدا گرفتی ئەم تاکەکەسە ئەبستراکتە کە ئەمانە باسی دەکەن ئەوەیە کە *لە ڕاستییدا* لە پیاوەوە شێوەی دراوەتێ. ئەو چەمکە بێجنسە تەنیا خەسڵەتێکی جوانکاریی هەیە و بەس. ئەو چەمکە ئەو ڕاستییە دادەپۆشێت ـ زۆر جارییش فرە چەوت ـ کە لە پراکتیکدا تاکەکەس وا کە قسەی لەسەر دەکرێت کە ئیتر بە ڕاستیی پیاوە.

ئەم نموونە پیاوانەیە کە وا پێی لەسەر دادەگیرێت کە بێجنسە و ئاوا کەسێتیی بە بەردا دەکرێت هەموو کاتێک وەک بەو جۆرەی کە چارلس تایلەر Charles Taylor ـ ی فەیلەسوف پێی لەسەر دادەگرێت بە ڕوونی ئاشکرا نییە. چارلس تایلەری فەیلەسوف دەڵێت ژیانی بەختیاریی زۆر شت دەگرێتەوە، لەوانە سەرپەرشتیکاریی بەخێوکەری خێزانە بۆ خۆشەویستانی خۆی ـ واتە ژن و منداڵەکانی (1989:46) . ئەم شێوە نموونە بێجنسەی کە بە پیاو دراوە زۆر جار بە نەرمی ڕەنگ دەکردرێت وا کە تاکەکەس ئەو کەسەیە کاری تەواوی هەبێت،

خزمەتی سەربازیی تەواو کردبێت، منداڵی لێ نەزابێت و هتد. نموونەی باڵای هاونرخیی تاکەکەسەکان سەرەڕای هەموو شتێک دیارە کە لەسەر یەکسانیە لە ناو پیاوان خۆیاندا، ئەمە هەروەها لەو میتافۆرە جنسئامێزانانەشدا دیارن کە لە ناو تیئۆریی سیاسەتدا دەهێنرێنەوە، بۆ نموونە:

> لیبرالیزم *تاکەکەس* لە جەستەی ئۆرگانیی دەکاتەوە، بەلانی کەمەوە لە بەشێکی زۆری *ژیانیدا –لە دەرەوەی منداڵداندا دەی ژیەنێت*، هەڵیدەداتە ناو جیهانێکی نادیار و پەنهانە بۆ خەباتکردن لە پێناوی مانەوەدا. دیموکراسیی جارێکی تر ئەو *تاکەکەسە* لەگەڵ *کەسانی وەک خۆیدا* گرێ دەداتەوە، بە شێوەیەک کە کۆمەڵگا جارێکی تر بەو یەکێتیەی ئەوان دابمەزرێنێتەوە، نەک وەک یەکەیەکی ئۆرگانیکیی، بەڵکو وەک کۆمەڵەیەکی تاکەکەسانی ئازاد. (چەمینەوەکان هی ئێمەیە، ماریبیا و سیسلی)
> (Bobbio 1990:43

فێمێنیزم ئەو بیرە ڕەت دەکاتەوە کە جنس بە *لایەنێکی وجود* یان *ڕووانگەیەکی سیاسەت* دادەنێت کە مومکین بێت بە ئارەزوو هەڵبژێردرێت یان نا. لەو بارەیەوە مۆد ئێدواردس Maud Eduards دەنووسێت کە بیریارانی نەریتی هەڵەیەکی ئەقڵیی گەورە دەکەن کاتێک وا بەرخورد دەکەن "هەر وەک ئەوەی بتوانرێت ڕەفتاری ئافرەتان لە پێوەندی لەگەڵ پیاواندا لە سیاسەتی `دروست´ جیا بکرێتەوە" (1993:100) . شتێک بە ناوی سیاسەتی `دروست´ وجودی نییە کە لە `بان´ جنسەوە بێت.

بەو شێوەیە ڕەخنەی دووپاتبووەوە دژ بە تیئۆری سیاسەتی نەریتی لە مەڕ ئەوەیە کە جنس لە توێژینەوەی دەستەڵات و سیاسەتدا دەردەهاوێژرێت. کاتێک کە ئافرەتان لە توێژینەوەکەدا نابن، یاخود کاتێک کە بە هەڵە چەمکگەلی جنسیی بێلایەنانە بەکار دەبردرێت، ئەوا پێوەندی دەستەڵات لە نێوان ئافرەتان و پیاواندا پەنهان دەکرێت. ئەگەرچی تیئۆری سیاسی مۆدێرن بە هەمان شێوەی ئاشکرا وەک هی کۆن ئافرەتان پشتگوێ ناخات، بەڵام هێشتا ئەوی دەخرێتە بەردەست و دەگوترێت و لە ئارادایە هەر ئەوەیە کە سیاسەت سەبارەت بە ئەقڵ و ئاوەزە، نەک سەبارەت بە جەستە، سێکس، خێزان یان ئەشتومەکی مەتریاڵی ڕۆژانەی ژیانەش.

فێمێنیزم بەو شێوەیە دەخوازێت ئەو سنوورە حەتمیانە بشکێنێت کە تیئۆری نەریتی لە نێوان سیاسەت و ناسیاسەتدا دای دەنێت. لە ناو تیئۆری فێمێنیزمیدا ژمارەیەک لە لێکدانەوە و لە چەمکی سیاسی جودا هەن. فێمێنیزم لە دایەلۆگی خۆیدا لەگەڵ تیئۆری نەریتی سەرنج لەسەر ئەوە دادەنێت کە چۆن ئینستوتە

(دامەزراوە) سیاسیەکان بتوێژرێنەوە. پرسیارەکان لە پێش هەر شتێکدا سەبارەت بەوەن کە چۆن دامەزراوەکان ڕیفۆرم (بیراز) بکرێن تا بەشداریکردنی ژنان لە سیاسەتدا هاسان بکرێت و ڕاستەقینەی ژیانی ئافرەتان ئاوێتەی ژیانی سیاسی بکرێت.

کاتێک کە جنس دەخرێتە ناو توێژینەوەی سیاسیەوە ئەوا ناکرێت پێناسەی سیاسەت تەنیا لە ئاستی دامەزراوەی سیاسیدا بکرێت وا کە بە نەریت لێی تێگەیراوە. پێوەندی نێوان ئافرەتان و پیاوان تەنیا لەو بەشانەی کۆمەڵگادا دروست نابن کە بە نەریت بە سیاسی دەبینرێن. لەبەرئەوە دەبێت هەروەها گۆڕەپانە کۆمەڵگایەتیەکانیش و ئەو پێوەندیانەش کە لە تیئۆری نەریتییدا بە ناسیاسی دەبینرێن بتوێژرێنەوە. بەو شێوەیە فێمێنیزم هەر لە گەورەکردنەوەی چەمکە سیاسیەکەدا ناوەستێت تا دۆخە سیاسیەکەش بگرێتەوە، بەڵکو تەنانەت سنووری نێوان گشتیی و تایبەتییش و سنووری نێوان بازاڕ وماڵیش دەخاتە ژێر پرسیارەوە. بەم شێوەیە ئەمە بەو مانایە دێت کە فێمێنیزم وردبژاری هەرە بناخەکانی *نیزامی سیاسی* دەکات و لە نوێوە پێشنیار دەدات کە بۆ نموونە چی بە سیاسەت دادەنرێت، کێ بۆی هەیە سیاسی ڕەفتار بکات و سیاسەت دەبێت لە چ فۆرمێکدا بکرێت تا بە سیاسەت دابنرێت.

کە فێمێنیزم وجودی جنس وەک دەروازەی ڕامانێکی تیئۆری بۆ توێژینەوەی سیاسەت بەکار دەبات، بەو مانایە نایەت کە جنس لە قاڵبێکی هەتاهەتاییدا دەبینێت و پێی وایە کە هەر وا دەمێنێتەوە. لە تیئۆری فێمێنیزمدا جنس شتێک نییە کە لە سەرەتاوە *هەبووبێت*، بەڵکو شتێکە کە *دروست دەکرێت*. بۆیە نێزیکەی هەموو جۆرەکانی تیئۆری فێمێنیستیی فۆرمولەبەندیە کلاسیکییەکەی سیمۆن دی بوڤوا Simone de Beauvoirs لەمەڕ ئەوەی کە "مرۆڤ وەک ئافرەت لە دایک نابێت، بەڵکو دەکردرێت بە ئافرەت" (1949:13) لە دڵەوە وەردەگرێت.

بەم هەنگاوە تیئۆری فێمێنیستی هەوڵ دەدات کە چەمکە سیاسیەکە فراوانتر بکات تا ئەوی کە *سیاسیە* وەک *ناسنامەی سیاسی* politics of identity بڕەوی هەبێت. پرسەکان سەبارەت بەوەن کە جنس بە چ واتایەک دێت، جنس چۆن دروست دەکرێت و جنس چۆن جیاوازی دەستەڵات ڕەوا دەکات (شەرعیەت پێ دەدات). هیچ "سرووشت" ێک یان "بایۆلۆژیەکی" یەکدەستیی نییە کە خۆی لە خۆیەوە بێت و بتوانێت شتێک بە ناوی ژنانە و پیاوانە بخولقێنێت. تەنانەت خودی ئەو باسکردنە بایۆلۆژیانەیەی ئافرەت و پیاوان کە هەیە و کە دەکرێت دەبێت بخرێتە ناو ڕووانگەی دەستەڵاتەوە. پیاوان و ئافرەتان چۆن دروست دەکرێن بەوەوە پێوەندە کە نیزامی دەستەڵات لە نێوان جنسەکاندا چۆن ڕاگیراوە.

تیئۆری فێمێنیستی بەو شێوەیە مەبەستی نییە کە ئەو پرسیارە بکات یان وەڵام بداتەوە کە ئافرەت *لە ڕاستییدا* چییە. هەروا ش ئەو پرسیارە ناکات کە ئافرەت لە سرووشتی خۆیدا وەک پیاوە یان جودایە – مەسەلەیەک – کە خۆی لە خۆیدا وای کردووە پیاو ئەو نۆرمە بێت کە هەموو شتێک بە باڵای ئەو بپێورێت، بکێشرێت، سنووردار بکرێت و شی بکرێتەوە.

پرۆفیسۆر جوان سکات (١٩٩٦) Joan Scott پێی وایە کە پرسی لەمەڕ لێکچوون یان لێکنەچوونی جنسەکان، پیاو و ئافرەت، شتێکە کە تەنیا دەتوانرێت وەک بەشێک لە میراتی مێژوویی فێمێنیزم لێی تێ بگەیرێت. فێمێنیزمی مۆدێرن لە ناکۆکیگەلی ناو بیرەکانی فەلسەفەی ڕۆشنگەرییەوە سەبارەت بە تاکەکەسی ئەبستراکت سەرچاوە دەگرێت، بیری سەبارەت بە ئازادی، یەکسانی و برایەتی هەموو مرۆڤەکان بە مەشقێکی ڕووناکبیریی واوە پێوەستە کە مرۆڤەکان دەگۆڕێت بە کۆمەڵە کۆپیەکی نموونەی گەردوونیی (پرۆتۆتیپێکی ئیونیڤێرساڵیی). لەو مەشقە ڕووناکبیرییەوە ئەو گرفتە پەیدا دەبێت کە چۆن ئەم کۆپیانەی نموونە گەردوونیەکە لێک جودا بکرێنەوە. چۆن تاکەکەس دەتوانێت تاکەکەسێکی تایبەتی بێت ئەگەر تاکەکەس بۆ ئەوەی بتوانێت تاکەکەس بێت، ناچار بێت لە گشت تاکەکانی دیکە بچێت؟

پرۆفیسۆر جوان سکات ئاماژە دەکات کە چارەسەرەکە بۆ فەیلەسوفانی سەردەمی ڕۆشنگەریی ئافرەت بوو. بە دەرهاویشتنی ئافرەت لە ناو سیستەمە ڕۆشنبیرییەکدا ـ لەبەرئەوەی بە کۆپیەکی هاونموونەی پیاو دانەدەنرا ـ بوو بە ئەڵقە ونبووەکە. لەو جێیەی لەوەپێشی کە دەر لە سیستەمەکە بۆی دیاری کرابوو، لە دەرەوەی برایەتییەکەدا، ئافرەت بوو بە ئەوی دیکە. ئافرەت بوو بە جەستەی جیاوازیەکە، کرا بەو جیاوازیەی کە ئەرکی ئەوەی پێدرا هەبوونی تاکەکەسێتی تاکەکەسی پیاو بسەلمێنێت.

بەو شێوەیە ئافرەتان دەکەونە ناوەڕاستی ناکۆکی (پارادۆکسی) سیاسەتەوە. بۆ ئەوەی ببن بە تاکەکەس و وەک تاکەکەس ببینرێن دەبێت واز لە ئافرەتتێتی خۆیان بهێنن. ئەگەر بێت و هەر پێ لەسەر ئافرەتێتی خۆیان دابگرن، دەبێت واز لە هەموو هیوایەکی بە تاکەکەسبوون بهێنن. بەڵام ئەم ناکۆکیە هی ئافرەتان نییە. ناکۆکیەکە سەرئەنجامی سیستەمێکی سیاسیە کە لەسەر شاردنەوەی پێوەندی نێوان جنس و دەستەڵات دامەزراوە.

## ٢

## جنس و دەستەڵات

### لەش و جنس

ئێمەی مرۆڤ كە وەك لەش و وەك جنس لە ئاستی ڕۆژانەدا هەین شتێكی بەڵگەنەویستە. ئێمە ناتوانین بیر لە بوونێك لە دەرەوەی هەبوونی جنسدا بكەینەوە و هەروا ناشواتنین بیر لە بوونێكیش لە دەرەوەی لەشدا بكەینەوە. لەش و جنسی ئێمە ئەوەن، لەوەش دەچێت خۆیان ڕوون بن، كە بناخەی بایۆلۆژیی ژیانمانن و كە دەمانكەن بە ئافرەت یان بە پیاو.

لێتوێژینەوەی مێژوویی لەسەر لەشبینی و جنسبینی لە مێژوودا ئەوە نیشان دەدات كە ئەوەی ئێستا بە ڕاستیەكی گومانهەڵنەگر دادەنرێت ـ كە ئافرەت و پیاو دوو جۆر جنسی لێكجودای بایۆلۆژیین – لە مێژ نییە ئاوا ڕوونە.

مێژووناسی ئەمەریكی، توماس لاكوەر (١٩٩٠) Thomas Laqueur دەڵێت كە لە مێژووی خۆرئاواییدا دوو شێوەی تەواو لێكجودا بۆ لەشبینی و جنسبینی هەن و ئەوجا لەسەر ئەو بناخەیە دوو ناوی لەمە ناوە، مۆدێلی یەكجنسیی و مۆدێلی دووجنسیی. مۆدێلی یەكجنسیی بەو واتایە دێت كە لە وجوددا تەنیا یەك دانە جنس هەیە ـ جنسی پیاو. ئافرەت لێرەدا سەر بە جنسێكی تایبەت بە خۆی نییە. جنسی ئافرەت تەنیا زركۆپیەكی جنسی پیاوە و لەشیشی زركۆپیەكی لەشی پیاوە. ئەم جۆرە لەشبینیە لە دەمی ئەنتیكدا برەودار بوو تا لە ناو سەدەی هەژدەهەمدا جێی بە مۆدێلی دووجنسیی لێژ بوو.

مۆدێلی دووجنسییش تێڕوانینە مۆدێرنەكەیە لە لەش كە جیاوازیی جنسیی، واتە هەبوونی دوو جنس، بە شتێكی حاشاهەڵنەگر دادەنێت. ئافرەتان و پیاوان دوو جەمسەری دژ بەیەك، واتە دوولایەنی بەروئاوەژووەكەن (دایكاتەمن) و خودی ئەم پێداگرتنە بەروئاوەژووەش دەگەڕێتەوە بۆ باسە بایۆلۆژیەكە و قامك دەخاتە سەر "سرووشتێكی" نەبزووا و نەگۆڕ.

ئەریستۆی فەیلەسوف یەكێكە لەوانەی باسی مۆدێلی یەكجنسیی كردووە. ئەریستۆ دەنووسێت كە ڤاگینای (ناوزێی) ئافرەت لە ڕاستییدا كێرێكی ناوەكیی ئاوەژوو دانراوە. تۆوی پیاو بەرامبەر بە خوێنی مەهكی مانگانەی ژنانە. ژنان بە هۆی ئەوەوە كە پلەی گەرمیی لەشیان نزمە ناتوانن ئەو خوێنە بكوڵێنن تا ببێت بە تۆوێكی سپی.

هەمان جۆرە تێبینی لەو كتێبانەدا كە لە سەردەمی ڕێنێسانسدا لەسەر زانستی توێكارییین (ئەناتۆمیی) دەردەبڕدرێنەوە. لەم كتێبانەدا ناوزێی ئافرەتان وەك كۆپیەكی بۆ ناوەوە و سەربەرەوخواری كێری پیاوان چوێندراوە. ڤاگینا كێرە، منداڵدان لە ڕاستییدا گونێكە و هێلكەدانەكانیش كیسەی مەنین (شەهوەتن). (١٩٩٠) Laqueur

كاتێک مۆدێلی دووجنسیی توانی جێی مۆدێلی یەكجنسیی بگرێتەوە بە هۆی كارتێكردنی لێشاوی ئەو بیرە مۆدێرن و كولتورییەی خۆرئاواوە بوو كە بە ڕۆشنگەریی ناسراوە و كە لانی كەم بووە مایەی سەرهەڵدانی زانستی سرووشتیی. بەڵام خۆ مۆدێلی یەكجنسیی نەک هەر یەكسەر ون نەبوو و بەڵكو تا سەدەی بیستهەمیش هەر بەردەوام بوو. كە ئەو دوو مۆدێلە یەكتر ڕەت ناكەنەوە و دەتوانن پێكەوە بگونجێن لە تێڕوانینی سیگمۆن فرۆییدا (١٩٣١) Sigmund Freud دەردەكەوێت كە سەبارەت بەوەیە چۆن ساختمانی لەشی ئافرەت كار دەكاتە سەر گەشەی دەروونیی ئافرەتان. باسەكەی فرۆید لەمەڕ ئافرەت لەوێوە سەرچاوە دەگرێت كە لە ڕاستییدا جیاوازیەكی جنسیی لە نێوان كیژان و كوڕانی بچكۆلەدا نییە. جیاوازیەكە بۆ یەكەم جار لە قۆناخی فالیسیەوە Phallisian phase[13] دەست پێ دەكات. كچان ئەو دەم بە كێرۆكەكەی penis.mini خۆیان، واتە قیتكەی خۆیان، ئاشنا دەبن. فرۆید پێی وایە كە لە ڕاستییدا جێی خۆیەتی كە ئەم قیتكەیە وەک جێگری كێر ببینرێت.

تا ئەوێندەرێی، بۆچوونەكەی فرۆید لە هەرە نێزیكیەوە دەكەوێتە خانەی مۆدێلی یەكجنسییەوە: كچۆڵەیەک لایەنە پێچەوانەكەی پیاو نییە، بەڵكو ئەو كچۆڵەیە پیاوۆكەیەكە man.mini. دیارە "كێری" ئەو كچۆڵەیە ئێستا بەو شێوەیەی كە هەیەتی لەو قۆناخەیدا بچووكە، بەڵام هەر بە شێوەی جۆرە ئەسڵیەكە كار دەكات.

كاتێک كیژۆڵەكە دەگاتە قۆناخی ئودیپاڵ Odipial phase[14] بۆی دەردەكەوێت كە ئەوەی هەیەتی لە ڕاستیدا كێرێكی ڕاست نییە. ئا لەم ساتەدایە كە ئێرەیی بردن بە كێر پەیدا دەبێت و خەمۆكیی خەسین لای ئافرەت بناخە دادەنێت. كەواتە چارەنووسی ئافرەت ئەوەیە كە هەم ئەو شتەی نەبێت و كە هاوكاتییش لەو ترسەدا بژی كە ئەو تۆزەشی لە كیس بچێت كە هەرگیز لە ڕاستییدا نەیبووە. هەروەها فرۆید پێی وایە كە ئافرەت بە هۆی "لاوازیی گەڵوگونیەوە" بەشێوەیەكی پەسەندمەند

---

[13] قۆناخی فالیسیی Phallisian phase ئەو قۆناخەیە كە مێردمنداڵ خۆی تێدا دەناسێت.

[14] قۆناخی ئودیپاڵ Odipial phase ئەو قۆناخەیە كە بە پێی فرۆید كوڕ ئاشقی دایكی خۆی دەبێت. فرۆید ئەم دەستەواژەیەی لە داستانی ئۆدیپ پاشا كە داستانێكی یۆنانی كۆنە، خواستووە. لەو داستانەدا "ئۆدیپ" بە منداڵیی لە دایكوباوكی خۆی دادەبڕێندرێت و كە گەورە دەبێت پاشا، كە باوكی خۆیەتی، بێ ئەوەی بزانێت دەكوژێت و شاژن، دایكی خۆی، بێ ئەوەی بزانێت دایكی خۆیەتی، دەهێنێت. كاتێک كە ڕاستییەكەی بۆ دەردەكەوێت تازە چەند منداڵێكی لە دایكی خۆی بووە. بۆ سزادانی خۆی بە شانەیەكی زێڕ هەردوو چاوی خۆی كوێر دەكات. فروۆید لەم داستانەوە دەستەواژەی "قۆناخی ئۆدیپ" و "گرێی ئۆدیپ"ـی داهێناوە.

ناتوانێت گرێی ئۆدیپۆس لای خۆی چارە بکات. لەبەر ئەوەیە کە ئافرەت منی باڵا Superego لە هاوئاستی هی پیاودا پەیدا ناکات. ئەمەش وا دەکات کە ئافرەتان هەمان هەستیان بۆ ڕەوایەتی نییە کە پیاوان هەیانە. بەو شێوەیە دەروونی ئافرەت مۆرکی ئێرەیی هەڵگرتووە. ئەمە ئێرەییەکە کە ڕەگی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەتان بێ کێرن.

لە ڕووانگەی مۆدێلی یەکجنسی و دووجنسیەوە ڕوونکردنەوەکەی فرۆید لەمەڕ گەشەی شیکاری دەروونیی (سیکۆئەناتۆمی) ئافرەتان ئەوە دەگەیەنێت کە ئافرەت ناچارە لە پیاوۆکەیەکی مۆدێلی یەکجنسیەوە کە کێرۆکەیەکی هەیە خۆی بگۆڕێت بە دژەپیاوێکی دژەکێری ناو مۆدێلی دووجنسیی، واتە خۆی بکات بە ئافرەتی کوزدار.

لە لای منداڵانی بچووک، بە پێی مۆدێلە یەکجنسیەکە، هیچ جۆرە جیاوازیەکی بنەڕەتیی نییە. بەڵام کاتێک کچان گەورە دەبن ناچار دەکردرێن گرفتی نزمپلەیی ئەندامی زاوزێیان وا چارە بکەن کە، بە پێی مۆدێلە دووجنسیەکە، خۆ بکەن بە پێچەوانەی پیاو. بۆ ئەوەی ئافرەت بتوانێت ئافرەتی "ڕاستەقینە" بێت دەبێت چارەیەک بۆ نەبوونیی ئامرازی زاووزێی نێرانە، بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

دیدی سیگمۆن فرۆید لە لەشی ئافرەت نیشانی دەدات کە چۆن هەر دوو مۆدێلەکەی یەکجنسییش و دووجنسییش ـ لەگەڵ ئەوەشدا کە وەک پێچەوانەی یەکتر دەبینرێن ـ هەردووکیان هەر لە ڕووانینی پیاوەوە سەرچاوە دەگرن. تێڕوانینەکە دوو جۆرە، یان ئەوەیە کە ئافرەت پیاوێکی پێنەگەیوە بە کێرێکی ئاوەژووەوە، نەک دەرپەڕیو. یاخود وەک پێچەوانەی پیاو دەبینرێت کە لە بریتیی کێر کوزی هەیە. لە هەردوو مۆدێلەکەدا ئەو تەنیا خاڵەی کە لەبەرچاو دەگیرێت ستاتووی (پلەی) پیاوە. پلەی پیاو، وەک خاوەن ڕۆڵی سەرەکی پێ بەخشراو، لە هەردوو مۆدێلەکەدا قابیلی بزوواندن نییە.

لەشی ئافرەت بە بەردەوامی لە پێچەوانەی گشتییەکەدا وەک ئەوی تایبەت و ئەوی لادەر دەخرێتە بەردەست. لەو ڕێگایەوە کە پیاو، تیئۆریانەش و ئەزموونیانەش، دەستی بە سەر "مرۆڤ" ـ دا گرتووە، ئەوە هەر ئافرەتە کە دەبێت ڕوونبکرێتەوە. ئەو ڕوونکردنەوە و جیاوازییە پیاوان ناگرێتەوە.

> هەمیشە جنسی ئافرەتە کە دروست دەکردرێت؛ ئافرەت کەتەگۆریەکی (پۆلێکی) بۆشە. وا پێدەچێت کە هەر ئافرەت خاوەنی "جنسێک" بێت، چونکە خودی پۆلێنکردنەکە خۆی وەک ئەو لایەنەی پێوەندی کۆمەڵایەتیی پێناسە کراوە کە لەسەر بناخەی جیاوازیی نێوان جنسەکان دامەزراوە و کە هەمیشە پێوەرەکەی (ستاندەردەکەی) پیاو بووە. Laqueur (1990:22)

سەرباری ئەوەی كە چۆن بە درێژایی مێژوو لەشی ئافرەت باسی لێوەكراوە و خەملێندراوە، هەمیشە هەر بۆ ئەوە بەكار براوە كە زەمینە بۆ ئاستنزمی ئافرەت تەخت بكات. ئەوە پیاوە كە پێوەرە (نۆرمە) جا ئیتر ئافرەت وەک پیاووۆكەیەک یان وەک پێچەوانەی پیاو ببینرێت. ئەریستۆ دەتوانێت، هاوكات كە مۆدێلە یەكجنسیەكە پەسەند دەكات، جەختیش لەسەر ئەوە بكات كە ئەركی هەرە سەرەكی ئافرەت خۆنەواندنێتی لەبەردەم و بۆ ویستی پیاوەكەی. هەر بەو شێوەیەش ئەمڕۆ گۆتوبێژكارانی كۆمەلایەتی لە ڕووانگەی مۆدێلە دووجنسیەكەوە دەتوانن پێدابگرن كە ئەو دۆخە بایۆلۆژییەی كە ئافرەتان هەیانە ئۆتۆماتیكیی وایان لێ دەكات زیاتر بۆ چنین، ڕنینەوەی بەری دار و چنینەوەی دانەوێڵە بگونجێن وەک لە بڕیاردانی هۆشمەندانە و شیكردنەوەی پرسی ماتماتیک (Uvnäs Moberg & Robert 1994:31).

## جنس، جێندەر و دەستەلات

لێكۆڵینەوە لەسەر لەشبینی و جنسبینی لە مێژووی خۆرئاواییدا یەک بیری ناوەندیی فێمێنیستیی بە دروست دەسەلمێنێت كە ئەمەیە: جنس شتێكە كە دەبێت وەک سیاسیی ببینرێت، چونكە بێمەجاز ڕەواییێتی بە پلەنزمیی ئافرەتان و بە پلەبەرزیی پیاوان دەدات. هەر چییەک كە لە دەمێكی تایبەتی مێژووییدا بە "بایۆلۆژیی" یان بە "سرووشتیی" دادەنرێت پێویستە هەمیشە بخرێتە چوارچێوەی ڕووانگەیەكی دەستەلاتەوە. ئەمە "بەڵگە زانستیەكانی" ١٩٠٠ كانیش دەگرێتەوە كە پێیان دادەگرت گوایە هێلكەدانەكانی ژنان وشكهەڵدێن ئەگەر بێت و خۆیان بە خوێندنی بالاوە خەریک بكەن، ئەمڕۆش "لێكۆڵینەوە" ـی وامان دەخرێتە بەردەست كە گوایە شیردان دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی توانستی هۆشمەندیی ئافرەتان (١٩٨٩ Eagle Russet، ١٩٩٣ Borelius).

ئەو بیرەی كە جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە لەش/بایۆلۆژیی و دەستەلاتی كۆمەلایەتی ـ سیاسی پێكەوە بەندن لە گەلێک لاوە بەگژ شێوەكانی بایۆلۆژیی چارەنووسازدا biological determinism دەچێت، ئەو بیرە بەگژ ئەو خۆڕوونكردنەوەیەدا دەچێت كە پلەنزمیی ئافرەتان بە هەبوونی منداڵدانەوە و پلەبەرزیی پیاوانیش بە بەرهەمهێنانی مەنیەوە (شەهوەتەوە) دەبەستێتەوە. بەلام پێوەندی نێوان جنس و دەستەلات چۆن دەردەكەوێت و چۆن لە جیاوازیە جنسیە كۆنكرێتیەكان بگەیرێت و تیئۆریانە مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێت، لە گۆتوبێژی فێمێنیستیدا ناكۆكی زۆری ناوەتەوە. ئایا هەر بە هیچ شێوەیەک دەشێت كە لەسەر *خودی جنس*، لەسەر جیاوازی بایۆلۆژیانەی جنس، ئاخاوتن بكرێت، یاخود جنس و بەندیوارییەكانی جنس

بێ هیچ ئەملاولایەک بە مرۆڤبوونەوە پێوەستە و ئەوەش بەو واتایە دێت کە بونیادێکی کۆمەڵایەتی هەیە؟!

فێمێنیستیەکان لەو ڕێگایەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم پرسانەدا کردووە کە چەمکێکی تایبەت، واتە جێندەر، دابهێنن بۆ ئەوەی بتوانن کە دروست ئەو لایەنە کۆمەڵگەیی و کۆمەڵایەتیانەی جنس بهێننە ناو باسەوە کە هەن. لە سالآنی ١٩٧٠ کان لە وێژەی فێمێنیستی ئەنگلۆسێکسییدا دەست کرا بە بەکارهێنانی چەمکی جێندەر و لە ناو سالآنی ١٩٨٠ کانیشدا ئەو چەمکە هێنرایە سوێدیشەوە. لە ناو بیریارانی فێمێنیستی جودادا پێناسەی جێندەر جیاوازە. چەمکی جێندەر بەگشتی بۆ دیاریکردنی واتا کۆمەڵایەتیەکەی جنس یاخود بۆ لێکدانەوەی جنسی بایۆلۆژیی بەکاردەبرێت.

یەکێک لە زووترین پێناسەکانی چەمکی جێندەر هی گایل ڕۆبیین Gayle Rubin ـ ی ئەنترۆپۆلۆژە. سیستەمی جێندەر هەموو ئەو پێوەندیە کۆمەڵایەتیانەی گرتووەتە خۆی کە لە جیاوازی جنسی بایۆلۆژییەوە سەرچاوە دەگرن. گایل لە سالی ١٩٧٥ دا دەنووسێت کە:

> سێکس هەر سێکسە، بەلام چی بە سێکس دادەنرێت ئەوە بەتەواوی و کولتوریانە دەستنیشانکراوە و هێڵراوەتەوە. هەموو کۆمەڵگایەکیش سیستەمی سێکس/جێندەری خۆی هەیە. سیستەمی سێکس/جێندەر بریتیە لە کۆمەڵێک داب و دەستوور کە بە هۆیانەوە کەرەستە خاوە بایۆلۆژیەکەی سێکسی مرۆڤ و زێدخستنەوە، بە دەستتێوەردانی کۆمەڵایەتی و بە ئاکاری نەریتیی جودای پەسەندکراو، شێوەی پێدراوە، جا ئیتر هەندێک لەو نەریتبەندێتییە با چەندیش بێ مانا بن. (Rubin 1975:165)

لەم پێناسەیەدا بایۆلۆژی و جیاوازیە جنسییە لەشییەکە وەک شێوەیەک کەرەستە و وەک بناخەیەکی ئاماریی بۆ سیستەمی جێندەر نیشان دەدرێت. بایۆلۆژی کەرەستەی خاوی سیستەمی جێندەرە. ئەو گرفتانەی کە لەم پێناسەیەوە پەیدا دەبن ئەوەن کە چۆن و کە ئەگەر شیاو بێت بتوانین سنوورێکی دیار لە نێوان خودی بایۆلۆژی و لێکدانەوە کۆمەڵایەتیەکە بۆ بایۆلۆژی، دابنێین. جۆری تێگەیشتنەکان لەسەر بایۆلۆژی لە نێوان کولتوری جودا و قۆناخی جیاوازدا دەگۆڕێت. بایۆلۆژی شتێکی یەکجاری و بڕێنراوە نییە و بە پێی کات دەگۆڕێت.

لەگەڵ ئەمەشدا پێویست ناکات کە چەمکی جێندەر بە تەواوی وەک پێناسەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ جیاوازیی جنسی بایۆلۆژیی ببینرێت. جێندەر تەنانەت لەلایەن ئەو بیریارانەشەوە بەکاردەبرێت کە خودی جنسپۆلێنیی فیزیکی/بایۆلۆژی وەک شتێکی تەواو لە ڕووی کۆمەڵآیەوە ساختمێندراو دەبینن، وەک شتێک کە مرۆڤ دروستی دەکات. سوزانە کێسلەر Suzanne Kessler و وێندی ماکێننا Wendy Mckenna (١٩٩٥) ئەو بیرە، کە جێندەر لێکدانەوەیەکی کۆمەڵایەتی بێت بۆ جیاوازیی جنسی

(بایۆلۆژیی)، سەرەوبن دەكەن و بە شێوەیكی دیكە نیشانی دەدەن . سوزانە و وێندی بە پێچەوانەوە لەسەر ئەوە پێدادەگرن كە جێندەر "لە پێشدا" دێت؛ و جیاوازیە جنسیە لەشییەكە لەلایەن ئەو تێگەیشتنانەوە دیاری كراوە كە لەسەر جێندەر هەن. بیرۆكەكان سەبارەت بە هەبوونی جیاوازیی جنس وەک بڵێین "پێش" لە واقیعەكە هەن. ئەوە تێگەیشتنی ئێمەی مرۆڤ خۆمانە لە جنس كە بڕیار دەدات چۆن واقیع لێک دەدەینەوە و خودی واقیعەكە نییە كە بڕیار لەسەر لێكدانەوەكانی ئێمەی مرۆڤ دەدات.

كەواتە لە ڕاستییدا فیزیۆنۆمی مرۆڤ نابێت بە هیچ جۆرە بناخەیەكی سەقامگیر بۆ ئەو لێكدانەوەیە كە ئەو دوو جنسە هەر بایۆلۆژییكیانە دەبێت وا بن و هەم ڕاستەوڕاست پێچەوانەی یەكتریش (دایكاتەم) بن. بە هیچ شێوەیەک هیچ خەسڵەتگەلێكی فیزیكی نییە كە بە تەنیا بڕیار لەسەر بەندیواری جنس بدات. پیاوان هەر هەموویان مەنیدار (سپێرمدار) نیین و ئافرەتان هەر هەموویان هێلكەدار نیین. جیاوازیەكان لە نێوان پێكهاتە كرۆمۆسۆمیەكانی ئافرەتان و پیاواندا پێچەوانە (دایكاتەمیی) نیین و هۆرمۆنە جنسییەكانیش تایبەت بە یەكێک لە جنسەكان نیین. شایەت بتوانرێت پێوەرە فیزیكیەكان بۆ ئەوە بەكار ببرێن كە چی پیاوێک لە ئافرەتێک جیا دەكاتەوە، بەڵام ئەم پێوەرانە هەر خۆیان زادەی چۆنیەتی تێگەیشتن لە جێندەر. بۆ ئەوەی بتوانین بوونی ڕاستەقینەی ئافرەتان لە پیاوان جودا بكەینەوە پشت بەو بەرتێگەیشتنە دەبەستین كە بە تەنیا هەر ئەو دوو جنسە هەن ـ جۆری دیكە نییە ـ و جیاوازیەكەشیان پێوەندە بەو ڕووكەشە تایبەتیەی وجودیانەوە. (Kessler & McKenna ١٩٨٥)

> زانینی زانستییانە وەڵامی پرسیاری "چ شتێک مرۆڤێک دەكات بە پیاو یان بە ئافرەت؟" ناداتەوە. بەڵكو ڕەوایەتی (مەشروعیەت) دەدات بەو زانیاریەی (هەروەها وا پێ دەچێت زەمینەشی بۆ فەراهەم بكات) كە دەمێكە هەیە و لە بەردەستدایە سەبارەت بەوەی مرۆڤێک ئیتر یان ئافرەتە یان پیاو و كە ئەسڵەن هیچ زەحمەت نییە ئەو دوو جنسە لە یەک جیابكرێنەوە. هەبوونی جیاوازییە بایۆلۆژیی، سایكۆلۆژیی و كۆمەڵایەتیەكان بەرەو دووجنسبینیمان نابەن. بەڵكو خودی ئەو دووجنسبینیە كە هەر لەسەرەتاوە هەمانە دێت و هەبوونی جیاوازیی بایۆلۆژیی، سایكۆلۆژیی و كۆمەڵایەتییمان بۆ "دەدۆزێتەوە". (Kessler & McKenna 1985:163)

تێگەیشتن لەوەی كە *واتای* جنس و بە جنسێكەوە گرێدران دیاردەیەكی كۆمەڵایەتیە، واتە شتێكە كە كۆمەڵگا دروستی دەكات، لە تیئۆری فێمێنیستییدا بەردی بناخەیە. كێسلەر و ماكێننا Kessler و Mckenna هەنگاوێكی زیاتر دەنێن و دەڵێن هەر خودی ئەو بیرە كە جنس وەک ڕاستەقینەیەكی فیسیۆلۆژیی دادەنێت

خۆی ساختارێکی کۆمەڵیانەیە. فێمێنیستانی دیکە هێندەی تریش ئەو بیرە دەبەنە پێش و دەڵێن گرینگە کە بە تەواوی دەست لەو بیرە هەڵ بگیرێت کە باس لە هەبوونی ڕاستەقینەیەک دەکات "لە ژێر" ئەو باسانەدا کە لەسەر جیاوازیی جنس و لەشن.

> کارێکی سەختە دژ بەو حەزی پرسینە بووەستریێت و نەپرسرێت، "بەڕاستیی ئەو جیاوازیانە، ئیتر لەژێر هەر هەموو ئەو باسانەوە کە هەن، کامانەن کە لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا هەن". *ئەوەی ئێمە وەک زانستکار و وەک فێمێنیست پێویستە دەنگێکی بدەینێ ئەوەیە کە نە شتێکی وا هەیە و نە شوێنێکی وا کە ناوی لە ژێر هەر هەموویەوە بێت*. ( Star, qou. Haraway (1981:476

واتای پیاوبوون یان ئافرەتبوون لە هەموو شتێک دادەبڕدرێت کە پێوەندی بە بایۆلۆژی یان لەشەوە هەیە. ئەگەر واقیع لە سەرتاسەرییدا بە تەواوی وەک دەربڕینێکی لە زماندا بنیاتراو ببینرێت، ئەوە بێگومان ئەم تێڕوانینە دەبێت هەروەها لەشی مرۆڤیش بگرێتەوە. ئەو بیرەی وا دادەنێت کە شتێک "لە دەرەوەی" بۆچوونی مرۆڤدا هەیە، هەر خۆی لە خۆیدا بۆچوونێکی مرۆڤییە.

بەم ڕووانگەیە چەمکی جێندەر بۆ ماناداں بەو ڕەفتار و وێناکردن و کردارانە بەکاردەبرێن کە لە هەڵپەدان بیسەلمێنن کە جنس بەڕاستی بوونی هەیە. جودی بوتلەر (١٩٩٣) Judith Butler دەنووسێت کاتێک فێمێنیزم واقیعی پۆلێنی جنس بە شتێکی دروست وەربگرێت بەو کارە نیزامی جێندەر بەهێز دەکات لە جێی ئەوەی هەوڵ بدات هەڵی بووەشێنێتەوە. ئێمە لەبریتی ئەوە دەبێت لە خۆمان بپرسیین کە کاتێک پۆلێنی ئافرەتان و پیاوانمان قبوڵ بێت و بەکاری ببەین چ جۆرە پێوەندگەلێکی دەستەڵات دەبەینە پێش. پۆلێنی جنس بە تەواوی وەک کردەی کۆمەڵ و زمان دەبینرێت: جنسیش بە تەواوی هەر وەک جێندەر دروست کراوە. جنس بە ڕاستی لە ناو کەللەدایە، نەک لە بەینی ڕانەکاندا.

بەڵام ئێڤا لوندگرێن Eva Lundgren ـی سۆسیۆلۆژ (١٩٩٣) پێی وایە فێمێنیزم بەو شێوەیە لە مەترسیی دایە بکەوێتە کۆلآنێکی بنبەستی تیئۆریەوە ئەگەر بێت و ئەو مانا کۆمەڵایەتیەی پۆلێنکردنی جنس لە لەش و لە بایۆلۆژیی داماڵێت. کۆلآنە بنبەستەکە هەر هەمان شت دەبێت، هەم بۆ ئەوانەی وەک ڕوبیین Rubin پێیان وایە کە بایۆلۆژیی شتێکی چەسپاو و نەگۆڕە، هەم بۆ ئەوانەش کە هەبوونی واقیعی یەک لەشی بایۆلۆژی بە دامەزرێندراوێکی کۆمەڵایەتی دانانێن.

ئێڤا لوندگرێن دەپرسێت مرۆڤ چۆن بتوانێت لە زەبروزەنگی پێوەست بە سێکس بتوێژێتەوە، وەک زەوتکردنی سێکسی[15]، ئینسێست[16] و لێدان و سووکایەتی کردن بە

---

[15] مەبەستم لە زەوتکردن تەجاوەزە، واتە دەستدرێژیکردنی سێکسی

ئافرەت ـ بێ ڕەچاوکردنی لەش و بایۆلۆژیی؟ ئەو کارە هەم لە پراکتیکدا نەشیاوە و هەم لە تیئۆرییشدا  بێبەرە کە هەوڵ بدرێت جنسی کۆمەڵایەتی و بایۆلۆژیی لە یەکتر جیا بکرێنەوە. زەوتکردنی سێکسی ئاکارێکی تەواو زەبروزەنگئامێزی ڕاستەقینەی فیزیکیە کە ناکرێت بچووک بکرێتەوە بۆ بونیادێکی کۆمەڵایەتی. ئەوی بایۆلۆژیی و ئەوی کۆمەڵایەتیە لە پێوەندیەکی پێچەوانەدا (دایکاتەمدا) نەوێستاون. هەر شتێک وەک بایۆلۆژیی لێک بدرێتەوە و شی بکرێتەوە ڕوویەکی کۆمەڵایەتی هەیە و  پێچەوانەکەشی دروستە.

پرۆفیسۆر تۆریل مۆی Toril Moi ـش (١٩٩٧) هەروەها باس دەکات کە چەند سەختە جیاوازییەکی ڕوون لە نێوان جنس و جێندەردا دابنرێت. تۆریل مۆی دەڵێت کە ئەو جیاوازیی دانانە زۆر بە هاسانی دەتوانێت ببێتە هۆی دروستبوونی دیتنێک کە پێی وایە دەشێت مرۆڤ بەسەر لایەنی جنس و جێندەردا دابەش بکرێت. ئیڤۆن هیردمان Yvonne Hirdman ـ یش هەروەها ئەم جۆرە دیتنە ڕەت دەکاتەوە. ئیڤۆن هیردمان بە پێی تێگەیشتنی خۆی لە جێندەر دەیەوێت لە لێکدانەوەکانیدا جێگای هەردوو ڕووانگە بایۆلۆژیەکە و کۆمەڵایەتیەکەش بکاتەوە: ئەم دووانەیە هەرگیز نابێت لێک داببڕێن.

> جێندەر شتێکە کە پێویستە [...] "ئاڵۆزتر" لە چەمکی "جنسی کۆمەڵایەتی" لێی تێبگەیرێت. جنسی کۆمەڵایەتی دروستکراوێکی پڕ ناکۆکیە و بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە کۆی هەردوو یەکەی "جنس" + "کۆمەڵایەتی" ـ ـە، هەروەک ئەمە فۆرمولێکی ماتماتیکیی هاسان بێت، وەک چۆن ١+١= ٢. بۆ تێگەیشتن لە جێندەر پێویستە مرۆڤ تێ بگات کە ١ و ١ دوو یەکەن کە بەڕاستی وجودیان نییە. ئەو یەکانە هەر نیین. بەڵکو تەنیا یەک دانە دووان هەیە.
> هیردمان (Hirdman 1990:76)

گفتوگۆی فێمێنیستیەکان سەبارەت بە پێوەندیەکانی نێوان ئەوی کە کۆمەڵایەتیە و ئەوی کە بایۆلۆژییە زۆرن و لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرن. ئایا ئەم جۆرە دابەشکردنە هەر هیچ ماقوڵیەکی تێدایە؟ ئەگەر وەڵام نەخێرە، ئایا ئەوە چ مانایەکی لەسەر تێگەیشتنی پۆلێنی جنس هەیە؟ بەڵام ئەوی لە گفتوگۆ فێمێنیستیەکەدا بناخەییە ئەو تێگەیشتنەیە کە ناکرێت جنس/جێندەر لە پێوەندیەکانی دەستەڵات جیا بکرێنەوە. ٢

---

[16] Incest ) ئینسێست گانەخێزانی) یان پێوەندی سێکسی ئەندامانی ناو خێزانێک لەگەڵ یەک

## جنس وەک نیزامی دەسەڵات

کەواتە ناوەندی تیئۆری فێمێنیستیی ئەوەیە کە جنس و دەسەڵات بە شێوەیەک پێکەوە گرێدراون کە ئافرەتان سیستەماتیکیانە بندەست دەکرێن. ڕەوتە (کۆنتێکستە) کۆمەڵایەتی و سیاسیەکە مانا و بایەخی جیاوازیی جنسیی دروست دەکات، دەهێڵێتەوە و دەگۆڕێت. بەو شێوەیەش پێوەندیە جنسیە نابەرابەرەکە کردەی نیزامێکی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و سیاسییە.

فێمێنیستی جۆراوجۆر بە شێوەی جودا تێگەیشتنی خۆیان لە جنس وەک نیزامێکی دەسەڵات دەردەبڕدرن. جیاوازیەکان لە بابەت ئەوەوەیە کە چی بناخەی نیزامی دەسەڵاتی جنسگەرییە، هەروەها چۆن و لەسەر چ ئاستێک ئەو نیزامە دەهێڵرێتەوە و دەگۆڕدرێت. ئیڤۆن هیردمان Yvonne Hirdman چەمکێک بەکار دەبات کە پێی دەڵێت سیستەمی جێندەر تا بەهۆی ئەوەوە بتوانێت باسی ئەو نیزامە لەسەر ئاستی سیستەمێکی بەرفراوان بکات.

> سیستەمی جێندەر دەبێت وەک ستروکتورێکی دەینامیکی (وەک سیستەم) تێبگەیرێت؛ ناوێکە بۆ "تەونێک" لە پرۆسە، دیاردە، چەمک و چاوەڕوانیی کە لە ڕێگای پێوەندی ناوەکی خۆیانەوە شێوەیەک لە هێزێکی ستروکتوریی و ڕێساگەریی دروست دەکەن. بەم شێوەیە سیستەمی جێندەر بریتیە لە نیزامێکی ستروکتوریی جنس کە لەسەر جیاوازیی جنسیی دامەزراوە. ئەم نیزامە فرە سەرەکییە هەروەها بووە بە پێشمەرجی نیزامی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی دیکەش لە کۆمەڵگادا. ڕیزبەندیکردنی مرۆڤ لە جێندەردا بووە بە بناخە بۆ نیزامە کۆمەڵایەتی، ئابووریی و سیاسییەکان. (Hirdman 1988:51)

سیستەمی جێندەر لەسەر دوو پرنسیپی کۆڵەکەیی یان "لۆژیکیی" بەندە. یەکەمیان لەیەک دوورهێشتنەوەی دوو جنسەکەیە، واتە ئەو بیرەی کە نابێت چەمکی ئافرەتی و پیاوانە تێکەڵ بکرێن. لۆژیکەکەی دیکە هیرارشی (پلەداریی) جنسە، کە پیاو وەک جۆرە "ئاسایی ـ ـەکە" و ئافرەتیش وەک جۆرە "لادەر ـ ـەکە" شێوەیان پێ دراوە. هەردوو لۆژیکەکە پێکەوە گرێدراون. هیرارشی جنس ـ ئەو ڕاستیەی کە پیاو کراوە بە پێوەر بۆ جۆری مرۆڤ ـ خۆی بەو لەیەک دوور ڕاگرتنەی دوو جنسەکە، ئافرەت و پیاو، ڕاگرتووە. (Hirdman 1988)

لە تیئۆری هیردماندا هاوکات کە تێگەیشتن لە سیستەمی جێندەر بە پلەی یەکەم بەندە بە وێناکردن، چاوەڕوانیەکان و مەزنەی بیرەوەیەوە، ئەوا فێمێنیستانی دیکە باوەڕیان وایە کە دەبێت لە ئاستێکی پتر کۆنکرێتدا بە دوای بنچینەی نیزامەکەدا بگەڕێین؛ بۆ نموونە لە کاردا، لە کەشی نەوەنانەوەدا (خێزان) یان لە ژیانی سێکس دا. ئەو فێمێنیستانەی کە کاریگەریی بیری مارکسیستی و

سۆشیالیستیان لەسەرە پێ دادەگرن کە *کار دابەشکردنی جنسیی* ئەو ئامرازەیە کە لە کۆمەڵگادا پایەی جودای پیاو و ئافرەت ڕادەگرێت.۳ بناخەی چەمکی پیاوانە و ژنانە لەوێدایە کە ئافرەتان لە بواری نەوەخستنەوەی تایبەتییدا کاردەکەن، بەرپرسیاری ماڵ، منداڵ و پیرن، هاوکات کە پیاوان لە بەرهەمهێانە "گشتییەکەدا" کار دەکەن.

> تێڕوانینیە مارکسیستیەکە [...] ئەوەیە کە دەتوانرێت ڕاستی پێناسەکردنی پیاو و ئافرەت لە دابەشکردنی جنسیانەی کاردا ڕوون بکرێتەوە کە لە ناو کۆمەڵێک ئاکار و هەڵسوکەوت و دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و کولتورییدا جێی پێ دراوە. ئەمەش دەکرێت لە بەردەوامیدا بخرێنە ناو تیئۆریەک کە دەتوانێت دابەشکردنی جنسیانەی/کۆمەڵایەتیانەی کار ڕوون بکاتەوە. [...] لە کۆمەڵگایەکدا کە جیاوازی دابەشکردنی جنسیانەی کار بە بەرفراوانی هەیە، ئەوا بێگومان پێناسەکردنی جیاوازی پیاوان و ئافرەتانیش ڕاستیەکە. (Holmstrom 1984:465)

ئەگەر دابەشکردنی کار لە نێوان جنسەکاندا خاو بکرێتەوە یان بگۆڕدرێت، ئەوا گۆڕانی نیزامێکی دەستەڵاتی جنسیی ـ کەم یان زۆرتر ئۆتۆماتیکی ـ شوێن پێی ئەو گۆڕانکارییە هەڵ دەگرێت. ئەگەر هیچ دابەشکردنێکی جنسیانەی کار نەبووایە، ئەوا هیچ نیزامێکی دەستەڵاتی هیرارشی جنسیش نەدەبوو.

لە تیئۆری فێمێنیزمی ڕادیکالدا *ژیانی سێکسی* (سێکسیوالیتی) هەر هەمان ڕۆڵی ناوەندیی هەیە وەک چۆن لە مارکسیزمدا کار هەیەتی. ژیانی سێکسی، بەو شێوەیەی کە لە کۆمەڵگایەکدا شێوەی پێ دەدرێت، مۆرکی باڵادەستیی پیاوان هەڵدەگرێت و ئامرازێکە لە دەستی پیاواندایە. ژیانی سێکسی هێزێکی سرووشتیی، غەریزەیەکی ئاژەڵیی یان ڕەمەکیەکی سادە نییە، بەڵکو پێکهێنراوێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیە کە نیزامی دەستەڵاتی جنسیی بە پێوە ڕادەگرێت. ئەم نێوپێوەندیە کۆمەڵایەتی و سیاسیە لە کەشی خێزاندا، کەشێک کە ئافرەت تیایدا دووچاری زەبروزەنگ و تێسرەواندن دەبێت، و لە ڕێگای پۆرنۆگرافیی (ڕووتگەریی)، سوزانێتی و فۆرمی دیکەی بە سێکسیکردنی هەموو شتێک و سووکایەتی پێکردنەوە، ڕوودەدات.

فێمێنیستەڕادیکالەکان بەم قسانە مەبەستیان ئەوەیە کە دەستەڵاتی پیاو لە پێش هەموو شتێکدا لە هەبوونی ئەو ماف و و هەلانەدا خۆی دەردەخات کە بە هۆیانەوە پیاوان دەتوانن و بۆیان هەیە پێناسە بکەن کە چی سێکسە و کە سێکس بۆ ئەوەی سێکس بێت دەبێت چۆن بێت. ئەم ڕاستییە شتێکە کە بە ڕوونی لە دیدی گشتییدا لەسەر زەوتکردنی سێکسی بەیان دەکردرێت. کە زەوتکردن زەوتکردنە یان نا، بە زەوتکردن دابنرێت یان نا، شتێکە کە بە تەواوی لە ڕووانگەی پیاوەوە هەڵ دەسەنگێندرێت. تەنیا کاتێک زەوتکردن بە زەوتکردن دەبینرێت کە پیاوێک سێکس

بكات هەرچەندە كە بە باشی حاڵی ببێت ـ پیاوێكی واش دەبێت لەو دۆخەدا ئەوە تێ بگات – كە ئافرەتەكە هەر بە ڕاستیی سێكس ناخوازێت.

تەنانەت كاتێك كە هیچ نیشانەیەكیش دیار نەبێت كە ئافرەتەكە بەڕاستی *خوازیاری* كردنی *سێكسە*، هەر وا دادەنرێت كە ئافرەتەكە سێكس دەخوازێت. پێویست بەوە ناكات ئافرەتان بڵێن "بەڵێ" بۆ ئەوەی وا دابنرێت كە سێكس دەخوازن.

نەخێر، "دۆخی ئاسایی" ئافرەتان ئەوەیە كە بە بێ هیچ ئەملاولا و لایەك وا دادەنرێت هەمیشە خوازیاری سێكس كردن بن. تەنیا لەو بارودۆخەدا كە پیاوەكە حاڵی دەبێت كە ئافرتەكە لەو دەمەدا لە "دۆخەئاساییەكەی خۆی" لای داوە، ئەوا سێكس بە "زەوتكردن" دادەنرێت. *ئافرەتەكە* خۆی لە ڕاستییدا چۆن لە ڕووداوەكەدا دەژی شتێكە هەرگیز ناتوانێت لەو بڕیارەدا دەوری هەبێت كە ئەو كارە بە زەوتكردن دابنرێت یان نا.

لە كۆمەڵگایەكی نابەرابەری جنسییدا سێكس دەربڕینێكی نۆرمی پیاوانەیە. ئەوەش ئەو نۆرمەیە كە دۆخی بندەستیی ئافرەتان بە شتێكی هەوەسهەستێن و زەوقهەستێن دەبینێت.

> ئەوی كە دەبێت بە شێوەپێناسەی ئافرەت ئەوەیە كە چی هەوەسی پیاو هەڵدەستێنێت، واتە هەموو شتێكی هەموو ئافرەتێك. كیژە بە حەیا و بە ئابڕووەكان، ئەوانەی بە سەرمۆر دادەنرێن، وێستاو لەسەر ئەو پلە سەكۆیە ڕەووشتیەی كە ئاخریەكەی هەر لە سەری ڕادەكێشرێنە خوار "ئارەزووبزوێنن". كیژە بەدڕوو و سۆزانییەكان تووڕەكەر و "جووكدەرن" و شایانی هەر چییەكن لێیان بكرێت. بەكۆمەڵایەتیكردنی جێندەر ئەو پرۆسەیەیە كە تیایدا ئافرەتان وایان لێ دەكرێت خۆیان وەك بوونەوەری سێكسی بناسن، وەك بوونەوەرگەلێكی بۆ پیاوان دروستكراو ، بەتایبەتیش بۆ بەكارهێنانی كرداری سێكی پیاوانە. (Mac Kinnon 1989b:110)

بەو جۆرە فێمێنیستە ڕادیكالەكان دێن و دەپرسن بۆ دروست دەبێت لە ژیانی سێكسدا بەرابەریی هەبێت، هاوكات كە پێوەندی بەرابەریی لە نێوان جنسەكاندا لە هیچ بەشێكی دیكەی ژیاندا بوونی نییە. نیزامی دەستەڵاتی جنسیی تا بەردەرگای هۆدەی نووستن نایەت و لەوێدا بوەستێت، بەڵكو بە پێچەوانەوە دەشێت سەركانیی ئەو نیزامە لە ناو خودی پێخەفدا بێت. پیادەكردنی دەستەڵات شتێكی تایبەتیی (شەخسیی) نییە. پیادەكردنی دەستەڵات پیادەكردنی سیاسەتە. بەو شێوەیەیە كە سێكس دەبێت بە ڕەفتارێكی سیاسی و پۆرنۆگرافییش دەبێت بە مەشقێكی سیاسیی. فێمێنیست و نووسەری ئەمەریكایی بەناوبانگ، ئەندریا دۆركین لەم بارەیەوە دەڵێت:

"هەر شێوەیەک لە تەجاوەز بە لەشی ئافرەت دەتوانێت تامی کردنی سێکس بدات بۆ پیاو؛ ئەوەیە کرۆکی ڕاستەقینەی پۆرنۆگرافیی". ( Dworkin 1987: 138)

توێژینەوەی فێمێنیستی هەیە ئەو بیرە دەخاتە ژێر پرسیار کە پێی وایە هەر بە تەنیا فشاری سێکسی و زەبروزەنگ پێوەندی نێوان پیاوان و ئافرەتان مۆرکدار دەکەن. ئەمان دەڵێن کە زەبروزەنگی سێکسی هەمیشە وەک هەڕەشەیەک دژ بە ئافرەتان هەر هەیە و لە ئارادایە، تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە بە ڕەسمیی یەکسان و بەرابەرن، بەڵام ئەوە خودی زەبروزەنگەکە نییە کە ئەو پێوەندیانە خەسڵەتدار دەکات. پرۆفیسۆری زانستی جێندەر، ئانا یوناسدۆتیر ( Anna Jonasdottir 1992) لەبری ئەوە پێی وایە کە خاڵە ناوەندیەکە ئەوەیە کە ژن لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا ئەڤین و میهری خۆی دەبەخشێت و کە پیاوان سوودی بەرئاوەژووی لێ وەردەگرن.

ئەو شێوە پێوەندیە سێکسوالە کۆمەلایەتییەی ئەمڕۆ هەیە و بەربلاوە ئەوەیە کە هێز و وزەی خۆشەویستیی ئافرەتان، کە ئازادانە دەیدەن و دەیبەخشن، پیاوان بە تەواوی ئاوەژوو کەڵکی لێ وەردەگرن. (222 : 1992) Jonasdottir

بەو شێوەیە هەندێک بیریار ئەو جۆرە سێکسبینیە وەک ڕوویەکی ناوەند لە نیزامی دەستەڵاتی جنسییدا دەبینن و تیایدا قووڵ دەبنەوە. تەنانەت لەو تیئۆریەشدا کە بە "تیئۆری سێکسی نابەجێ queer theory "[17]ناو دەبرێت سێکس هەر لە ناوەندا دانراوە. لەم تیئۆریەشدا پیاو بە بێدەربەست دادەنرێت و کرۆکی تیئۆریەکە دژایەتی ئەو پێداگرتنەی هێتەرۆسێکسوالیتی (سێکسی جنسی پێچەوانە) دەکات کە "خۆی بە بەردی بناخەی کۆمەڵگا و کولتور دادەنێت" (Kulick 1996:10).

---

[17]"تیئۆری سێکسی نابەجێ queer theory" بێنەوبەرەیەکی زۆر لەسەر مانای ئەم ناوە هەیە. وشەکە کە ئینگلیزیە لە هەمان دۆخی خۆیدا هەم کردارە، هەم ئاوەڵناوە و هەم ناویشە و بە کۆمەڵێک مانای جیاواز دێت، وەک: سەیر، ناتەواو، گومانلێکراو، جێی گومان، بەڕەمز، بێنرخ، ساختە، حیز، قوندەر، دوودەکی و شتی دیکە. بەلآم تیئۆریەکە مەبەستێتی کە هەموو شێوەیەکی سێکسی ئاسایی، وەک هێترۆسێکسوالی، کە لەلایەن کۆمەڵگاوە مۆری پەسەندی لێ دراوە، و شێوەکانی دیکەی سێکسی سەقامگیر و وابەستەی وەفاداری لە بەینی ژن و پیاودا بخاتە ژێر پرسیارەوە. من پێموایە کە "تیئۆری سێکسی نابەجێ" وەرگێڕانێکی دروستە لەو ڕووەوە کە تیئۆریەکە جەخت لەسەر ئەو جۆرە پێوەندیە سێکسانە، لە پێوەندی دەستەلآتی کۆمەلآیەتی، سیاسی و هتد. دا، دەکات کە هێترۆسێکسوالیتی بە نەریت بە "نابەجێ" یان بە "سەیر، خراپ، بەد" لە قەڵەمیان دەدات. تیئۆریەکە لە زۆر لاوە ڕۆشنایی دەخاتە سەر تابوی سێکس لە نێوان جۆرەکانی ژنانی هاوجنسباز، دوودەکی و قوندەرانداا.

"تیئۆری سێکسی نابەجێ queer theory" ڕەخنە لەو پێداگرتن و بۆچوونە دەگرێت کە پایەی هێترۆسێکسوالیتی (سێکسی جنسی پێچەوانە) بەوەوە دەبەستێتەوە کە گوایە هێترۆسێکسوالیتی پێداویستیەک و بڕیارێکی سرووشتیە و کە ناسنامەی مرۆڤ مێژووییانە و کۆمەلایەتیانە شێوەی پێدراوە. بەو شێوەیە تیئۆری سێکسی نابەجێ لەبری ئەوەی سەرنج بخاتە سەر ئەوەی کە چۆن جنس و دەستەلات پێکەوە گرێدراون، سەرنج دەخاتە سەر ئەوە کە چۆن سێکسبینی وەک نیزامێکی کۆمەلایەتی هەم شێوە بە جنس دەدات و هەم بە ناسنامەش.

فێمێنیستی جودا بە شێوەی جیاواز وەلامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە دەپرسن چی چارەنووسسازە بۆ نیزامی دەستەلاتی سێکسیی، چۆن وەبەرهەم دەهێندرێتەوە و چۆن دەگۆڕدرێت. بەلام فێمێنیستان هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەوە نیزامێکە ـ سیستەمێکە ـ کە دەستەلات بەو شێوە نارەوایە دابەش دەکات. خالێکی دیکەی بنچینەیی هاوبەش ئەوەیە کە دەلێت ئەم نیزامە (سیستەمە) بڕیار لەسەر پێوەندیەکانی نێوان پیاوان و ئافرەتان وەک گرووپی کۆمەلایەتیی دەدات. ئەمە ئەوە دەگرێتەوە کە پلە و پێناسەی ئافرەتبوون کەسیی (شەخسیی) نییە و شتێکیش نییە کە ئافرەتان بتوانن هەروا بە هاسانی هەلیبژێرن یان ڕەتی بکەنەوە.

> هیچ ئافرەتێک ناتوانێت لە واتای بە ئافرەتیبوون لە سیستەمێکی بە جنسکراوی کۆمەلایەتییدا دەرباز ببێت [...] (MacKinnon 1989b:104f).

تیئۆری فێمێنیستی لەو خالەوە پێ هەلٔ دەگرێت کە جنس لە بناخەدا پۆلێنێکە کە کۆمەلایەتی و سیاسیانە دروست کراوە. واتای جنس لە پێکەوەپێوەستبوونێکی کۆمەلایەتی و سیاسی بگۆڕدا بە بەردەوامیی دروست دەکردرێت و دەهێلدرێتەوە. هاوکات کە ئەو جنسبەندیە بووە/دەبێت بە بناخەیەکی سەرەکیی بۆ ناسنامەکانمان. جنسی مرۆڤ، پیاوبوون و ئافرەتبوونمان، کاریگەرییەکی زیاتری هەیە، کاریگەرییەك کە هەم تایبەتیە و هەم سیاسییش، وەک بۆ نموونە لە ڕەنگی قژ یان شوێنی نیشتەجێبوونمان. کاتێک کە منداڵێک لە دایک دەبێت یەکەم پرسیار کە لە بارەیەوە دەکردرێت لەمەڕ جنسە. "[ئەو] دەمەی کە کۆرپەیەک تیایدا بە مرۆڤ دەکردرێت ئەو ساتەیەکە پرسیاری 'ئایا کچە یان کوڕە؟ ' ـ ی تێدا وەلام دەدرێتەوە" (Bulter 1990:111).

## تێبینی

١. گفتوگۆی لەمەڕ پێگەی ئۆنتۆلۆژیای جیاوازی جنسدا هەندیك جار لە تێرمی دژبەیەکدا لە نێوان ئیسینسیالیزم بەرانبەر کۆنستروکتیڤیزمدا دەکردرێت. بە ئیسینسیالیزم مەبەست لەو پێوابوونەیە کە پێی وایە مومکینە هەم لەسەر جنس وەك خۆی بئاخێورێت و هەم بشتوانرێت ئەو واتایە دیاری بکرێت کە جنس لە ڕاستییدا هەیەتی. کۆنستروکتیڤیزستەکان دەڵێن ئەمە مومکین نییە. واتای جنس و تەنانەت جنس وەک ڕاستەقینەیەکی فیسیۆلۆژی ساختماندراوێکی کۆمەڵایەتیە. لەم ساڵانەی دواییدا بیریارانی زیاتر و زیاتر ئەو هەڵوێستە دەخەنە بەردەست کە دەڵێن دانانی جیاوازیەکی تیژ لە نێوان ئیسینسیالیزم و کۆنستروکتیڤیزمدا بێهودەیە و لە ڕاستییدا تیئۆری فێمێنیستیی لە پرسیارگەلی نەشیاودا قوفڵ دەدات. بۆ نموونە بڕوانە سارا دانیوس (١٩٩٥) و تۆریل مۆی (١٩٩٧، ١٩٩٤). Sara Danius (1995) & Toril Moi (1994, 1997)

٢. ئێمە بە باشمان زانی کە ڕاستەوڕاست چەمکی جنس بەکار ببەین لەبەرئەوەی کە لە ڕووی زمانەوانییەوە هاسانتر کاری لەگەڵدا دەکرێت وەک لە چەمکی جێندەر. لە تیئۆری سیاسییدا چمکی جنس بە کار دەبردرێت بێ ئەوەی کە ناچاریانە بەشکردنێک لە لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و ڕاستەقینەی بایۆلۆژییدا بکرێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە Hirdman (١٩٩٤) کە بە ئینگلیزی دەست دەکەوێت.

٣. ئالیسۆن ئیێم یاگەر (١٩٨٣) Alison M Jaggar فێمێنیزم بە سەر چوار ڕێبازی لیبراڵ، مارکسیست، ڕادیکال و سۆشیالیستیدا دابەش دەکات. ئەگەرچی ئەم دابەشکردنە بەربڵاوانە ئاساییە و ئەو ناولێنانانەش ڕۆشناییکارن ئێمە لەبری ئەوەی کە بە پلەی یەکەم بێین و فێمێنست بە پێی ئەو دابەشکردنە دابەش بکەین، هەندێك گیروگرفتی ناوەندییمان خستووەتە بەردەست.

٤. تێڕوانینێک لەسەر گەشەی بیری "queer theory تیئۆری سێکسی نابەجێ" لە جاگۆس Jagose (١٩٩٦) دا هەیە. هەروەها بشڕوانە:
Lambda nordica temanummer om queer teori, nr 3-4, 1996.

# ٣
# تاكەكەس، چین و جنس

## تاكەكەس و چین

تیئۆریی سیاسیی نەریتیی لە تاكەكەسێكی گشتیی و جنسنادیارەوە پێ هەڵدەگرێت. بەڵام لە لێتوێژنەوەیەكی وردتردا كە تیایدا قووڵ دەبیتەوە دەردەكەوێت كە ئەو تاكەكەسە گشتییە پیاوە. تیئۆریگەلێكیش كە تەنیا پیاوان تیایدا نیشتەجێن هەندێك دژواریی لەگەڵ خۆیاندا دێنن كاتێك كە لە پێوەندی نێوان جنس و دەستەلات دەتوێژرێتەوە. بەو شێوەیە بۆ تیئۆریی فێمێنیستیی خاڵێكی ناوەندیی ئەوەیە ڕوونی بكاتەوە كە بە چ شێوەیەك چەمكی گرینگی وەك تاكەكەس و هاوولاتیی نۆرمەكەیان پیاوە.

لەو ڕەخنانەدا كە لە تیئۆری ڕەوایەتی كاریگەری لیبراڵ، جۆن ڕاوڵس John Rawls (١٩٧١)، دەگیرێت نیشان دەدرێت كە چۆن لەپشت بێجنسبوونیەكی پێ لەسەرداگیراوەوە بەڵگەهێنانەوە و بۆچوونی ئەندرۆسێنتریكیی (پیاوگەریی) شاردراوەتەوە. هەڵوێستە لیبرالییەكە ئەوەیە كە مرۆڤ لە بنچینەدا تاكەكەسێكی ئۆتۆنۆم و ئاوەزدارە (ئەقڵمەندە) و كە ئەم پایەیەش لە كۆنتێكستە (دۆخگەلە) كۆمەڵایەتیەكەیان و تایبەتمەندییە كەسییەكان گرینگترە. لە تیئۆری ڕاوڵسدا چەمكی تاكەكەس ناوەندە. دیدی ڕاوڵس لەسەر تاكەكەس لەپێش هەرشتێكدا لەو بیرەوە دەردەبڕدرێت كە پێی دەگوترێت دۆخی سەرەتایی ”original position“. "دۆخی سەرەتایی" پێوەرێكی لێكدانەوەیە بۆ مەزەنە و ئاشكراكردنی ئەو پرنسیپە ڕەواییەی كە تاكەكەس لەو دۆخەدا هەڵی دەبژێرێت كە خۆی تێدا دەبینێتەوە. ئەوجا بە ئاماژە بە هەڵبژاردەی تاكەكەس ڕاوڵس ئەو پرنسیپانە دەكات بە دەلیل كە پێی وایە جێی خۆیەتی كۆمەڵگایەكی ڕەوا بەڕێوە ببەن.١ لە دۆخی سەرەتاییدا تاكەكەسەكان لە پشت "پەچەیەكی نەزانییەوە"[18] خۆدەبیننەوە. تاكەكەس پێویستە هەموو تایبەتمەندیەكی كەسێتی خۆی بخاتە ئەو لاوە و هەموو شتێك پشتگوێ بخات كە لە تاكەكەسی دیكە جودای دەكاتەوە. تاكەكەسەكان بەو شێوەیە لە دۆخە سەرەتاییەكەدا نازانن كە خۆیان كێن. بەڵام، ڕاولس پێی وایە كە ئەو تاكەكەسانە سەبارەت بە نەوەی داهاتوو هەست بە بەرپرسیاریی دەكەن و جێی خۆیەتی سەرەڕای هەموو شتێك وەك سەروەری خێزانەكان ببینرێن (128 :1971).

---
[18] ”veil of ignorance”

ئەو ڕەخنە فێمێنیستیەی کە لە تیئۆریەکەی ڕاوڵس دەگیرێت بە زۆریی لەسەر ئەوەیە کە ڕاوڵس سەروەری خێزان دەئاخنێتە ناو دەلیلهێنانەکەیەوە (Okin: 1991). هەڵبەت سەروەری خێزانیش بە نەریت پیاوە. دەلیلهێنانەوەکەی ئەوەشی تێ دەکەوێت کە پێوەندیەکانی ناو خێزان دەکەونە ئەو دیو مەودای پرنسیپە ڕەواییەکەوە. لە تیئۆری ڕاوڵسدا خێزان لە خودی خۆیدا ڕەوایە. ئەو پێوەندیانەی ناو دەستەڵات کە لە خێزاندا دروست دەکرێنەوە، دابەشکردنی دەستەڵات لە ناو خێزاندا و پرسی جۆراوجۆری وەکو چۆن منداڵآن کۆمەڵایەتییانە دەکردرێن بە ئافرەت و بە پیاوی گەورەساڵ بە هیچ شێوەیەک ناخرێنە ژێر باسی جیدی و هێنان و بردنەوە. ئەو ئەو پرسیارە گرینگانە وەک تایبەت (کەسی) و ناسیاسی دەبینێت.

فێمێنیستانی دیکە ڕەخنەیان لە خودی ئەو چەمکە تاکەکەسییە بەگشتکردراوە و لە بیری ڕاوڵس لەسەر هاومافیی هەیە. ڕاوڵس مەبەستێتی کە لە دۆخی سەرەتاییدا هاومافیی لە نێوان تاکەکەسەکاندا بەرقەرارە. ئەو هاومافییە لەو ڕێگایەوە پەیدابووە کە هیچ کەسێک سەبارەت بە خودی خۆی نازانێت. هەموو تاکەکەسەکان یەکسانن، ئەوان هەر وەک یەک ئاوەزدارن و بە تەواوی هەر وەک یەک بیردەکەنەوە. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئایا چەمکی هاومافییەکە ناوەڕۆکی خۆی لە دەست نادات کاتێک کە هاومافییەکە لەسەر بناخەی هاوشێوەیی دامەزراوە، کە مرۆڤەکان دەبێت هاوشێوە بن تا هاوماف بن (Åse 1993). پرسیارەکە هەروەها ئەمەشە ئەگەر چەمکێکی هاومافیی کە لەسەر پرنسیپی هاوشێوەیی دامەزرابێت، ڕزگارکەری ئافرەتان دەبێت یاخود لە جیاتی ئەوە دێت و زیاتریش جیاوازیەکانی دەستەڵات لە نێوان جنسەکاندا دەشارێتەوە (هەروەها بڕوانە لاپەڕە ٤٥).

بیریارانی دیکەی لیبرال هەر بەو شێوەیە وەک جۆن ڕاوڵس ڕەخنەیان لێگیراوە لەبەرئەوەی کە وەک پرسێکی دەستەڵات و دادوەریی ناڕواننە خێزان و پێوەندی نێوان ئافرەتان و پیاوان. هەروەها فێمینستگەل ڕەخنەیان لە مارکسیزم گرتووە لەبەرئەوەی بەو شێوەیەی وەک ئەو باسی دەکات خێزان کەشێکە (سفارێکە) کە بە هیچ هەلومەرجێک نەدەستەڵاتی تێدایە و نە ناهاوسەنگیی.

تیئۆری مارکسیستی پێ دادەگرێت کە مرۆڤ لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خۆیدا پێناسە دەکرێت و کە کۆمەڵگا خەسڵەتگرتووی ململانێی بەرژەوەندیی نێوان چینە جوداکانە. دانانی سرووشتی مرۆڤ بە کردەی کۆمەڵ بێگومان هەروەها خاڵێکی دەرکەوتووی فێمێنیستیشە، بەڵام تیئۆری مارکسیستی وای دادەنێت کە مرۆڤ بە پلەی یەکەم لە ڕێگای کارەکەیەوە، لە ڕێگای پێگەی لە ناو بەرهەمهێناندا دیاری کراوە. کار کتومت وەک کار لە ناو بەرهەمهێنانی کۆمەڵگایی و گشتییدا پێناسە دەکرێت. کاری نەوەخستنەوەی (زاووزێکردنی) ئافرەتان لە ماڵەوەدا دەکەوێتە ئەودیو ئەوەی کە لە تیئۆری نەریتی مارکسیستیدا بە کار دادەنرێت. لەبەرئەوەی کە ئافرەتان نەکەوتوونەتە ناو پێوەندیەکی تایبەتی جۆرەکانی بەرهەمهێنانەوە

ئەوا خۆیان ناتوانن چینێک پێک بهێنن. بەو شێوەیە تەنانەت لە ناو مارکسیزمیشدا چەمکی بناخەیی لە خاڵی ڕیئالیتەی پیابوونەوە پێناسە دەکردرێت. لە مارکسیزمیشدا دووبارە هەر پیاو نۆرمە.

فێمینیستگەل بە شێوەی جودا هەوڵیان داوە ئەو چەوتییە لە تێگەیشتنی مارکسیزم لە جنس و لە ڕۆڵی جنس ڕاست بکەنەوە. لەبەرئەوە لێرەدا ئەم جۆرە گۆتوبێژە لە چوارچێوەی مەوداکانی جنس و چیندا دەخولێتەوە. پرسیارەکان لەلایەکەوە دەربارەی ئەوەن کە لە بندەستەیی ئافرەتان تێبگەین لە خاڵی پێهەڵگرتن لەو کاری جنسبەندیەوە کە هەیانە و کە پێیان دەدرێت، بەر لە هەر شتێک کاری نەوەخستنەوەی ماڵەوەی بێ مووچەیان، لەلایەکی دیکەوە تێبگەین کە چۆن سیستەمی سەرمایەداریی و نیزامی دەستەڵاتی جنسیی پێکەوە گرێدراون. ئەو فێمێنیستانە پێیان وایە کە بە زۆری بە هۆی کاردابەشکردنی جنسییەوەیە کە بندەستیی ئافرەتان دەهێڵرێتەوە، (بەراووردی پەڕەی ٣٧ بکە). ئەوە پێوەندیە ئابووری ماددیەکانە کە فۆرم بە خێزان دەدات و نموونەی نەریتی (ستیریۆتایپ) پیاو و ئافرەت بەرهەم دەهێنێت.

> دابەشکردنی بێئەملاولای کار بەپێی جنس، داهێنانێکی کۆمەڵایەتییە کە هەموو کۆمەڵگا ناسراوەکان تیایدا هاوبەشن، و کە هەم دوو شێوەی جنسی تەواو جودا وەبەرهەم دەهێنێت و هەم ناچاریشیان دەکات کە لەبەر هۆی ئابووریی لێک نێزیك ببنەوە. ئەمەش دەبێتە مایەی بردنی پێداویستی ژیانی سێکسیان بەرەو هێترۆسێکسوالیبوون کە کۆمەک بە زامنکردنی وەبەرهەمهێنانەوەی بایۆلۆژی دەکات. لە کۆمەڵگا زیاتر نموونەییەکاندا، ڕەنگە زاووزێی بایۆلۆژیانە بە شێوەی دیکەی تەکنیکیی دڵنیا بکرێت، بەڵام وا پێدەچێت کە دابەشکردنی کار بەپێی جنس تا ئەمڕۆش چارەسەرێکی گەردوونیی بێت. (Hartmann 1981:16)

بەهەرحاڵ، هەوڵ لە تێگەیشتنی ژێردەستیی ئافرەتان وا کە پێوەستە بە دابەشکردنی جنسیانەی کارەوە بەرەو لایەنی دیکە دەمانبات کە لەژێر چەقی سەرنجدا دەخلیسکێن. ئایا دەتوانرێت کۆنترۆڵی پیاوان کە لەسەر لەش و سێکسی ئافرەتان هەیانە وەک دابەشکردنێکی جنسیانەی کار ڕوون بکرێتەوە؟ گرفتی دیکە ئەوەن کە چۆن سیستەمی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی و نیزامی دەستەڵاتی جنسی پێکەوە بەندن. ئایا ئەو دووانە سیستەمێکی پێکەوەگرێدراون و نیزامێکی دەستەڵات دروست دەکەن، یاخود ئەوان دوو سیستەمی جودان کە هاوکاری یەک دەکەن و یەکتری بەهێز دەکەن؟٢

ئەو زەحمەتانە کە دێنە پێش کاتێك هەوڵ دەدرێت فێمێنیزم و مارکسیسزم پێکەوە گرێ بدرێت (سینتێس بکرێن) لە بنەڕەتدا سەبارەت بەوەن کە مرۆڤ چۆن

دەتوانێت لە پێوەندیی نێوان جنس و چیین تێ بگات. ئەزموونی چەمکی چینایەتیی مارکسیستی بەتەواوی لەسەر جنس ڕوون نییە و گیروگرفتی تێدایە. ئەگەر ئافرەتان وەک چینێکی بە پێی جنس پێناسەکراو دەبینرێن کە بە هۆی کاری ناو ماڵەوە بندەستن، ئەوا دەبێت دیتنە خەڕەکیە (نەریتیە) مارکسیستییەکە سەبارەت بە کار دووبارە پێناسە بکرێتەوە. بێجگە لەوەش جیاوازی چینایەتی کە لە نێوان ئافرەتان خۆیاندا هەیە پەنهان دەکرێت. گیروگرفتێکی دیکە هەروەها ئەوەیە کە ئەو بندەستیەی بە هۆی ئەو بازاڕی کارەوە دروست بووە کە بەپێی جنس دابەش کراوە و کە ئافرەتان تیایدا کاری نزمووچەیان پێ دەدرێت، دەشاردرێتەوە. ( Armstrong & Armstrong 1986)

## یەکسانیی و جیاوازیی

فێمێنستی جودا کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەردوو پنتی مارکسیستی و لیبراڵی، کە چین لە ڕامانی یەکەمیاندا و تاکەکەس لە ڕامانی دووهەمیاندا ناوەندە، گرفتدار و نارۆشنن. بەو شێوەیە فێمێنیستان بە شێوەی جودا هەوڵیان داوە دیتنێک سەبارەت بە یەکسانی بهێننە بەرهەم کە نە پیاو وەک پێوەر دەبینێت و نە پێوەندی دەستەڵات لە نێوان جنسەکاندا دەشارێتەوە . هێڵی جوداکردنەوە لە گۆتوبێژەکەدا لە لایەکەوە لە نێوان ئەوانەدا تێپەڕ دەبێت کە دەڵێن چەمکی یەکسانیی ناوەندییە لە لایەکی دیکەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە لەبریتیی ئەوە سەرنج دەخەنە سەر جیاوازیی. ئێمە پێمان باشە ئەو دوو جۆرە ڕەوتە بە بیریارانی یەکسانیخوازی equality theorists و بیریارانی جیاوازیخوازی difference theorists ناو بنێین.

خاڵی ڕامان بۆ بیریارە یەکسانیخوازەکان لە بناخەدا لیبراڵە. ئەمان دەڵێن کە کۆمەڵگایەکی ئازادکراو لە نایەکسانیی جنس دەبێت پێداویستیانە بێ هیچ ئەملاولایەك *جنسبێلایەن* بێت. لە کۆمەڵگایەکی یەکساندا نابێت جنس هیچ واتایەک بدات.

> ئاییندەیەکی ڕەوا ئاییندەیەکە کە بێ جێندەر بێت. لە ستروکتوریی کۆمەڵایەتی و پیادەکردنەکانی ئەو ئاییندە ڕەوایەدا جنسی کەسێک، هەر هێندەی ڕەنگی چاو و درێژیی پەنجەی پێی، بایەخی دەبێت. (Okin 1989:171)

ئەو ڕاستییەی کە بێلایەنیی جنس بەزۆریی بووە بە ماسکی پیاوبوون، وا ناگەیەنێت کە چەمکێکی تاکەکەسی گشتیی، کە لەڕاستییدا بتوانێت پیاوان و ئافرەتانییش بگرێتەخۆ، مەحاڵێکی تیئۆریی بێت. بەپێچەوانەوە، زانستی تیئۆری

دەبێت چەمکگەلێک پێش بخات کە متمانەدارانە جنسبێلایەن بن و پڕ نەبن لە واتا و بارگەی جێندەری. لەم ڕووانگەیەوە ئەو لاسەنگییە ئەندرۆسێنتریستیەی (پیاوەتیگەریەی) کە بۆ نموونە لە تیئۆری ڕەوای ڕاوڵسدا هەیە بەئاشکرا گیروگرفتدار دەبێت. بەڵام ئەم ئەندرۆسێنتریسمە نابێت ببێتە هۆی پەسەندنەکردنی بیری چەمکێکی تاکەکەسیی جنسبێلایەنی گشتیی یان پەسەندنەکردنی جۆرێک لە تیئۆری ڕەوا، وەک ئەوی ڕاوڵس (Okin 1991). ڕەخنە لە هەبوون و لە برەوی نۆرمی پیاو نابێت ببێتە هۆی ئەوەی کە چەمکی تاکەکەسیی گشتیی تورِ بدرێت.

لەم بۆچوونانەدا یەکسانیی بەو واتایە دێت کە جیاوازیی وەک جنس، چیین یان تەمەن لە نێوان مرۆڤەکاندا نابێت بایەخیان هەبێت. بیریارانی یەکسانیخواز جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە تواندراوە چەمکی تاکەکسیی گشتیی سەرکەوتووانە لەلایەن گرووپی جودای بندەستەوە بۆ وەدەستهێنانی داوای ددانپیادانانی سیاسی بەکاربهێنرێت. ئافرەتان *سەرەڕای* ئەوەی کە جنسی ئافرەتیان هەیە داوای دەستڕۆیی دەکەن ـ چونکە مرۆڤن. ئەوان لەو ڕێگایەوە توانیویانە ئەو کارە بکەن کە بێن و پێدابگرن کە جیاوازیی جنسیی، بەتەواوی هەروەک جۆرەکانی تری جیاوازیی، دەکرێت تورِ بدرێت.

لەملاوە خاڵی ڕامان بۆ بیریارانی جیاوازیخوازی ئەوەیە کە هەر خودی بیرە یەکسانییەکە گرفتی تێدایە و ناڕۆشنە، چونکە لەسەر بناخەی بیرێکی پێشینە سەبارەت بە یەکسانیی، لەسەر چەمکێکی تاکەکەسگری ئەبستراکت، دامەزراوە. ئاریس ماریۆن یۆنگ (١٩٩٠) دەڵێت هەر هەوڵێک کە مرۆڤی کۆنکرێت بخاتە ناو چەمکێکی تاکەکەسیی گشتییەوە مەحکومە بە دۆڕان. خرکردنەوە و بەشداریی لەسەر بناخەی گشتێتی ـ واتە دامەزراندنی شێوەیەک لە بچووکترین کۆڵکەی هاوبەشی مرۆڤایەتی ـ بێ مەجاز لە ئاییندەدا دەبێت بە مایەی دەرهاویشتنی ئەوی تایبەت و کەسییە لە شیکردنەوەکاندا. گرفتەکە ئەوەیە کە ئەو چەمکە تاکەکەسییە گشتییە حیساب بۆ ئەو جیاوازیە لەشیی و کۆنکرێتییانە کە لە جنس، ڕەگەز و تەمەندا هەن، ناکات. گرووپە بندەستەکان، وەکو ئافرەتان، کەمینەی ئەتنیکی و ئایینزایی، هەم هەلی بەرەوپێشبردنی داوای سیاسیی خۆیان لە دەست دەردەهێنرێت و هەم هەلی داوای ددانپیادانانی سیاسییش کە بە هۆی جودایی خۆیانەوە داوای بکەن. ٣

لە ڕووانگەی دیدە جیاوازیخوازیەکەوە هەموو ئاماژەپێکردنەکان بە مرۆڤایەتیەکی یەک دانە جنسی (هاوجنسی) گەردوونیی ئەو واتایەی تێدا پەنهانە کە تەنیا یەک دانە جنسی تایبەتی لە ڕستییدا نۆرمە (پێوەرە) (Cavarero 1992). ئافرەتان و پیاوان نابێت بکردرێن بە تاکەکس یان بە هاووڵاتی جنسبێلایەن. ئەسڵەن هیچ تاکەکەسێکی بێجنس *بوونی* نییە؛ لە ڕاستەقینەدا ئەوی هەیە تەنیا ئافرەتان و پیاوانن. هەر هەوڵێک کە بدرێت بۆ هێنانەئارای چەمکی جنسبێلایەنیی

لەو دەرئەنجامگیریە (پرێمیسە) چەوتەوە پێ هەڵدەگرێت کە دەکرێت پۆلی جنس لە پۆلی مرۆڤ جیا بکرێتەوە. یەکسانیی لەنێوان ئافرەتان و پیاواندا بەو مانایە نایەت کە ئافرەتان بترنجێنرێنە ناو چەمکێکی تاکەکەسی گوایە جنسبێلایەنەوە. یەکسانێتی دەبێت ڕەچاوی ئەو ڕاستەقینەیە بکات کە مرۆڤایەتی لە دوو جنس، پیاو و ئافرەت، پێک هاتووە.

> جێی نکۆڵی نییە کە مرۆڤگەل لە دوو جنس پێک دێن. ئەگەر ئێمە بەدەربەست ڕاستییەوە دێین، ئەوا ڕاستیی دەبێت حیسابێک بۆ ئەو فاکتە بکات و واتایەکی پێ ببەخشێت کە ئەوە پیاوان و ئافرەتانن کە لە ڕستییدا هەن، نەک مرۆڤی تاکەکسی یەکجنس یان بێجنس. دەبێت ددان بەم ڕاستییەدا وەک شتێک کە پێوەستە بە هەبوونی مرۆڤەوە بنرێت،: تا هەتایە، لە ئێستا دا و هەر ئان و ساتێک کە مرۆڤێک دێتە ئەم جیهانەوە. (Cavarero1992:38)

پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە پۆلی جنس ڕاستەقینەیەکە بەو واتایە نایەت کە ئافرەت بوونەوەرێکی تایبەتییە و دەبێت ناوەڕۆک و پێناسەیەکی تایبەتی بدرێتێ. خۆ بیریارانی جیاوازیخوازی بە تێرمی خەسڵەتجودایی ئافرەتیی نادوێن. لە جیاتی ئەوە دێن و باسەکان ڕۆشن دەکەنەوە کە چۆن جیاوازیی جنسیی پێوەندیە دەستەڵاتیەکان بنیات دەنێت و کە ماف بە ئافرەتان بدرێت لە جیاوازیی خۆیانەوە سیاسیانە ڕەفتار بکەن. یەکسانیی ڕەسەن دەبێت لەسەر ئەوە بنیات بنرێت کە ددان بە جیاوازیی نێوان خەڵکاندا بنرێت، نەک لەسەر سەرکوتکردن یان پشتگوێخستنیان.

بیریارانی جیاوازیخوازی دەڵێن ئەو بیرەی کە پێی وایە جیاوازیی نابێت هیچ واتایەکی سیاسی هەبێت لە ڕاستیدا ئەو بایەخە دەشارێتەوە کە هەیەتی. گرووپگەلی بندەست دەبێت بتوانن داواخوازی مافگەلی سیاسی و نفوز (دەسترۆیی) بن لە دەرخاڵی دۆخی تایبەتی خۆیانەوە. بە پێچەوانەوە، تیئۆریسانە یەکسانیخوازەکان وەلام دەدەنەوە و دەڵێن ئێمە دەبێت بەسەرجیاوازیەکاندا زاڵ بین. فێمێنیزم دەبێت نە بیری یەکسانێتی وەلابنێت و نە بیرگەلی لەمەڕ مرۆڤایەتیەکی هاوبەش کە هێزی بزوێنەری سیاسی بە بیری یەکسانێتی دەدات.

## ئافرەتان "وەک ئافرەتان"

خاڵی هاوبەشی هەردوو بیریارانی جیاوازیخوازی و بیریارانی یەکسانیخوازیش ئەوەیە کە ئافرەتان وەک ئافرەت بندەستن، ئەگەرچی هەردووکیان خاوەن بیروڕای جودان سەبارەت بەوەی کە چی پێویستە بۆ دیاری کردن و گۆڕینی ئەو دۆخە ژێردەستییە. هاوکات فێمێنیستی دیکە هەن کە پرسیار لەو فێمێنیزمە دەکەن کە لە چەمکی ئافرەتبوونەوە پێ هەڵدەگرێت و کە پێی وایە ئافرەتان وەک ئافرەتان چەوساوەن. ڕەخنەگران دەڵێن کە بەکارهێنانی چەمکی ئافرەت/ئافرەتان هەروا بە درشتی و بێ دەستنیشانکردن و ئەوجا قسەکردنیش لەسەر ئەوەی کە ئافرەتان "وەک ئافرەت" بندەستن، گرفتەکەی لەوێدایە کە ئەو جۆرە چەمکانە خۆیان لە خۆیاندا ئەبستراکتن. ئەو چەمکە ئەبستراکتانە نە هەر واقیعە جوداکانی ئافرەتان ڕوون ناکەنەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەشیشێوێنن.

> بیرکردنەوە لە ئافرەت "وەک ئافرەت" چییە؟ ئایا لە ڕاستیدا ئێمە دەتوانین بیر لە "ئافرەتێتی" ئافرەتان بکەینەوە دەر لەو دۆخە کۆنکرێتەی کە ئەو لە ڕاستیدا ئافرەتێکی تایبەتە، جا ئافرەتێکی ڕەشپێستی چینی مامناوەندی بێت و لە ئەمەریکای باکووری بژی لە سەدەی بیستهەمدا یاخود ئافرەتە سپیپێستێکی هەژار بێت و لە فەرەنسا لە سەدەی هەڤدەهەمەدا ژیابێت؟ (Spelman 1988:13)

بە پلەی یەکەم فێمێنیستانی ڕەشپێست، لێسبیان (ژنانی هاوجنسباز) و فێمێنیستانی جیهانی سێهەمن کە ئەم جۆرە ڕەخنەیە لە فێمێنیستگەلی خۆرئاوایی هێترۆسێکسیوال دەگرن. کاتێک کە ئافرەتانی هێترۆسێکسوالی سپیپێست لەو خاڵەوە پێ هەڵ دەگرن کە ئافرەتان بندەستن، ئەوا لە ڕاستییدا دۆخی خۆیان دەکەن بە نۆرم. ئاودرە لۆرد (١٩٩٤) Audre Lorde ئاماژە بەوە دەکات کە ئافرەتانی سپیپێست و ڕەشپێست، لەو چوارچێوەیەدا کە ژیانکردن لە کۆمەڵگایەکی سێکسیست و ڕەگەزپەرستدا چ مانایەکی هەیە، بە تەواوی خاوەن ئەزموونی جودان. کاتێک مرۆڤ پێ دابگرێت کە ئافرەت وەک ئافرەت چەوساوەیە ئەوا ئەو جیاوازیانە پشتگوێ دەخردرێن. ئافرەتێکی ڕەشپێست شێوەیەکی پۆلی ئافرەتی سپیپێست نییە: "ئافرەتی ڕەشپێست ئافرەتێکی سپیپێستی ڕەنگکراو نییە" (Omolade, cit i Spelman 1988:13).

کاتێک کە زەوتکردنی سێکسی ئافرەت خەسڵەتی نواندنی دەستەڵاتی پیاوینەی لەسەر ئافرەت پێدەدرێت، ئەوە فەرامۆش دەکردرێت کە دەستدرێژییەکە هەروەها دەتوانێت مانای ڕەگەزپەرستیش بگەیەنێت. بۆ ئەوەی لە دۆخی ئافرەت لە ناو گرووپی جودای ئەتنیکییدا تێ بگەین تیئۆری فێمێنیستی دەبێت لە خاڵی ڕامانی

ئەزموونی تایبەتمەندیانەی خودی ئەو ئافرەتانەوە دەربچێت و سەرنج بدات کە چۆن ستروکتوری ڕەگەزپەرستانە و ئافرەتچەوسێنەرەوە پێکەوە بەندن ( Hill Collins 1993).

فێمێنیستە پۆستمۆدێرنیەکانیش ڕەخنەی لەو شێوەیە دەگرن. ئەمانیش مەبەستیان ئەوەیە کە هەر خودی دابەشکردنی مرۆڤ بەسەر ئافرەتان و پیاواندا شێوەیەکی دەستەڵات سەپێنیە. پرۆژەی پۆستمۆدێرنیی سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوە، لێککردنەوە و خستنەژێرپرسیاری شێوەسازیەکانی ناسنامەی ئێستایین بۆ ئەوەی لەوێندەرێوە هەلومەرج و توانا بۆ دروستبوونی ناسنامەی نوێتر و ئازادکارانەتر سازببن. ناسنامەی ئێمە – ئەگەر پیاو بین یان ئافرەت، ڕەشپێست بین یان سپیپێست، پاسکیلسوار بین یان ئوتومبێلسوار ـ هەرگیز پێشوەخت نەکەوتووەتە چنگمان. ناسنامە و گرینگیی ناسنامە هەردووکیان بە بەردەوامیی لە گۆڕاندان.

فێمێنیستە پۆستمۆدێرنیستەکان دەڵێن کە ناسنامەی مرۆڤ هەر بە سرووشت ناگوتاریە (discoursive)، واتە زمانیانە و کۆمەڵایەتیانە بڕیاری بۆ دراوە و ئەو چارەنووسەی پێدراوە کە ئێستا هەیەتی. گرفتی ستروکتورە گوتاریەکان ئەوەیە کە ئافرەتان وەک ئافرەت پێناسە دەکەن. هیچ ناسنامەیەکی ئافرەتیی "دروست" و "ڕاست" نییە کە لە "پشت" یان لە "ژێر" ئەوەوە بێت کە نیزامی دەستەڵات دروستی کردووە. دەربڕینی زمانیی و کۆمەڵایەتی ئافرەتیانە ئافرەت دەکەن بەخودی ئافرەت. ناسنامە شتێک نییە کە زمانیانە و کۆمەڵایەتیانە *دەر ببڕدرێت*. ناسنامە لە خودی دەربڕینەکانی *خۆی* پێک دێت، نە هیچی ترە و نە هیچی زیاتر.

> هیچ ناسنامەیەکی جێندەری نییە کە لە پشت دەربڕینە جێندەریەکانەوە بێت؛ ئەو ناسنامەیە هەر خۆی لە خودی ئەو "دەربڕینانە" سازبووە کە پێ دادەگیرێت کە گوایە سەرەنجامی ئەوون. (Butler 1990:25)

بە پێی ئەم ڕووانگەیە، کە ڕێگا بدرێت ئافرەتان ئاوا وەک ئافرەتان پێناسە بکرێن، تەنیا گوێڕایەڵییە بە چەوساندنەوەکەیان. لەم چوارچێوەیەدا جودیت بەتلەر (Judith Butler (1991:148 لەسەر ناکۆکیەکی فێمێنیزمیی دەئاخفێت کە پێی وایە هەیە. ئەم دەڵێت ڕامان لە خاڵی بە گرووپدانانی ئافرەتەوە بەستنەوە و دەستبەسەرداگرتنی خودی ئافرەتانە کە دەویسترێت ئازاد بکرێن. تیئۆری فێمێنیستیی، پۆستمۆدێرنە فێمێنیستەکان پێدادەگرن، دەبێت لەبریتی ئەوە بێت و ئەو ستروکتورانە بخاتە ژێرپرسیار و ڕەخنەوە کە ئافرەت دەکەن بە ئافرەت و بەوە کەمتر ڕازی نەبێت کە خودی پۆلێنە جنسیەکە وەک ئەوی هەیە هەڵبووەشێنێتەوە.

فێمێنیزم [...] خەباتی بەرابەرییە بۆ ئافرەتان. بەڵام نابێت ئەمە بە خەباتێک بۆ ناسینی بەرابەریی گرووپێکی ئیمپیریکی (ئەزموونیی) لێی تێبگەیرێت وەکو ئەوەی هاوکرۆک و هاوپێناسە بێت، واتە ئافرەتان، بەڵکو بە پێچەوانەوە، فێمێنیزم خەباتێکە بۆ دژایەتی هەموو ئەو فرەشێوانەی کە تیایاندا پۆلی "ئافرەت" لە ژێردەستەییدا جێی پێ دراوە. (Mouffe 1992:382)

کەواتە قسەکردن لەسەر ئافرەت وەک گرووپێکی بندەست بە مانای برەودان بە ناسنامەیەک دێت کە خۆی لە خۆیدا چەوسێنەرە. بێلەوەش بەو شێوەیە ڕووانگەیەکی ئێسێنسیالیش لەسەر ئافرەتان پیادە دەکردرێت، بەو واتەیەی کە ئافرەتان بوونێکی تایبەتیان هەبێت. ئەگەر ئێمە لەسەر ئافرەتان وەک گرووپ بئاخفێین وا پێ هەڵدەگرین کە سرووشتێک، ڕەووشتێک یان جۆرجودایییەکی تایبەتیی ئافرەتیانە هەبێت. پۆستمۆدێرنە فێمێنیستەکان مەبەستیانە کە بە بینینی ئافرەت "وەک ئافرەت" تەنیا برەو بە بیری نموونەی نەریتییانە (ستیریۆتایپ) دەدات سەبارەت بەوەی کە ئافرەتان دەبێت چۆن بن، و بەو شێوەیە ستروکتوری دەستەڵاتی هەنووکەیی بەهێز دەکات.

بەڵام ئایا فێمێنیزم، کە ئامانجی تێگەیشتن و گۆڕینی هەلومەرجەکانی ئافرەتانە، دەتوانێت بێ چەمکێک کە وەک گرووپ ئاماژە بە ئافرەتان بکات خۆی بەڕێوە ببات؟ ئایا ئەو جۆرە بۆچوونە کە ئافرەتان وەک ئافرەتان بە چەوساوە دادەنێت، پێداویستیانە بەو واتایە دێت کە بە تێرمگەلێک دەلیل بهێنێتەوە کە ئافرەتان بوونێکی تایبەتیان هەیە؟ کاترین ماککینۆن Cathrine MacKinnon بە نەخێر وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە ددەداتەوە و مەبەستێتی کە تێگەیشتن لە ئافرەتان وەک ئافرەتان هیچ پێوەندیەکی بە بوون یان سرووشتی ئافرەتانەوە نییە. ئەو تێگەیشتنە کورت و هاسان بۆ وەسفکردنی ڕاستەقینەی ئافرەتانە و بەس. ئەو ڕاستەقینەیەی کە ئافرەتان تیایدا بە ڕاستیی دەچەوسێنرێنەوە و زەبریان دەخرێتە سەر و دەستدرێژییان دەکردرێتە سەر وەک ئافرەت، نەک بە پلەی یەک وەکو ڕەشپێست، سپیپێست، هەژار یان زەنگین.

کاتێک کە ئافرەتانی ئەفەریکیی ئەمەریکی دوو جار زیاتر لە ئافرەتانی سپیپێست زەوتکردنی سێکسییان پێ دەکرێت، ئایا ئەوان وەک ئافرەت زەوتکردنی سێکسییان پێ نەکردراوە؟ ئەمە نە بەو مانایە دێت کە ڕەگەزی ئەوان بێبایەخە (ئیریلیڤانتە) و نە بەو مانایەش دێت کە زیانەکانی ئەوان دەکرێت لە دەرەوەی چوارچێوەی (کۆنتێکستێکی) ڕەگەزییدا ببینرێت. بە پێچەوانەوە، ئەوە بەو مانایە دێت کە "سێکس" لە ڕاستەقینەی ئەزموونگەلەکانی هەموو ئافرەتان *پێکهاتووە*، بە هی ئەوانیشەوە. (MacKinnon 1991:20)

بەرئەنجامێکی بەدەستهاتوو لەو تواناکارییەی کە قسە لەسەر ئافرەت وەک ئافرەت بکرێت هەروەها دەتوانێت ئەوە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت کە پێوەندی دەستەڵات لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا لە ژێر سەرنجدا نامێنێت. ئەوە بێگومان نەشیاوە کە قسە لەسەر بندەستێتی *ئافرەتان* بکرێت بێ هەبوونی تێگەیشتنێک لەمەڕ ئافرەتان وەک گرووپ. خودی چەمکی ئافرەتان مەرجێکە بۆ ڕەفتاری سیاسەتێکی ئافرەتیانە.

> ئێمە چۆن دەتوانین وا شێلگیرانە دژ بە سێکسیزم لە بەرژەوەندی ئافرەتاندا بدوێین ئەگەر پۆلێنەکە وەهمێک (دڕدۆنگیەک) بێت؟ ئایا بێ پەنابردن بۆ چەمکی "ئافرەت"، ئێمە چۆن دەتوانین داوای منداڵ لەباربردنی یاسایی، چاودێریی منداڵان بە دروستیی، یان مووچە لەسەر بناخەی گرینگیی بەراووردکراو بکەین؟ (Alcoff 1988:420)

ڕەخنەی دژ بە ڕووانگە پۆستمۆدێرنێکە هەروەها ئەوەیە کە جنس هەمیشە هەر دەبێت و ڕەنگیشە هەمیشەش هەر مانایەک بدات، ئەگەرچی ئەم مانادانە دەشگۆڕێت (Gatens1992). ئێمە یان ئافرەتین یان پیاو. ئێمە نە دەتوانین جنس لەبەر خۆمان دابکەنین و نە دەتوانین لەبیر خۆمانی ببەینەوە، با چەندیش بە ئارەزووەوە خوازیاری بین.

## تێبینی

١ ڕاوڵس Rawls پێ داگرێت کە مرۆڤەکان لە دۆخی سەرەتاییدا دەتوانن لەسەر دوو پرنسیپی ڕەوایەتی بنچینەیی یەک بگرن. یەکەمیان پرنسیپی گەورەترین ئازادی شیاو و بۆ هەمووەلایەکی یەکسانە. دووهەم پرنسیپیان دوو لکی تێدایە: کە نایەکسانیی کۆمەڵایەتی و ئابووریی دەبێت وا دابەش بکرێت کە (ئا) بە قازانجی ئەو مرۆڤانە بێتەوە کە خراپترین دۆخیان هەیە و (بێ) کە قازانجی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ببەسترێنەوە بە هاومەرجیی و هەلی یەکسانەوە بۆ هەموو لایەک. یەکەم پرینسیپیان لەسەر دووهەمیان دەوەستێت. بەو شێوەیە نابێت هیچ لایەنێکی ئازادی تاکەکەس وەلاوەبنرێت بۆ ئەوەی بۆ نموونە گەشەی ئابووری وەدەست بهێنرێت. ڕاوڵس پێی وایە کۆمەڵگایەک کە ئەو پرنسیپی ڕەواییانە تیایدا دابەشکردنی ماف و کەڵکە جۆراوجۆرەکان و بەڕێوە دەبات، دەبێت وەک کۆمەڵگایەکی ڕەوا ببینرێت، لەسەر ئەو بناخەیەش بە کۆمەڵگایەکی باش. (Rawls 1971)

٢ گفتوگۆی سەبارەت بە پێوەندی نێوان سەرمایەداری و بندەستێتیی ئافرەت، ئەگەر ئەو یەک سیستەم یان دووان بن کە پێکەوە دەبەسترێنەوە، لەو دەمەدا کەوتە ڕەوت کە هایدی هارتمان Heidi Hartman (١٩٨١) ئەوەی خستە بەردەست کە ناودەبرا بە "تیئۆری دوو سیستەمیی". هارتمان لەویدا پێ دادەگرێت کە نیزامی دەستەلاتی جنسیی (پاتریارکات) بوونیادێکی دەستەلاتی خۆیەتی بە بنکەیەکی دەستەلات و وزەیەکی خۆیەوە. نیزامی دەستەلاتی جنسیی بەو شێوەیە بەشێکی دروستکراو نییە لە ناو سیستەمی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییدا.

کورتەیەکی گۆتوبێژەکە لە ئافرەتان و شۆڕش: زەماوەندی ناشادی مارکسیزم و فێمێنیزم The Women and Revolution: Unhappy Marriage of Marxism and feminism دا دەست دەکەوێت.

هەندێک جار ڕوانگەجیاوازیەکە وەک فۆرمێکی نوێی پلورالیزمی ڕادیکال دەر دەبڕدرێت، لەویدا گەلێک جیاوازیی بەئەژمارد، نە هەر تەنیا جیاوازیی جنسیی، دەکەونە ژێر سەرنج. بۆ نموونە بڕوانە ئەیسنیستاین Eienstein (١٩٨٨).

# ٤
# کەسیی (تایبەتیی) و گشتیی

## دیاردەی کەسیی (تایبەتی) دیاردەیەکی سیاسییە

**"ئەوەی دیاردەی کەسییە، سیاسییشە!"** بەم فۆرمولەیە فێمێنیستەکان لە ١٩٦٠ ـ کاندا مەشخەڵێکیان فڕێدایە ناو گۆتوبێژی سیاسیەوە. دەربڕینەکە هێزێکی کاریگەری مەزنی دروستکرد و ڕەنگە زۆرترین لەو دەربڕینانە بێت کە کاتێک باسی فێمێنیزم دەکرێت دەهێندرێتەوە.

فۆرمولەکە ئەو دەم، هەر وەک ئێستا، شۆڕشێک بوو دژ بە نیزامی هیرارشیە (پیرامیدە) سیاسیەکە. لەو ڕێگایەوە کە پێ دابگیرێت کە ئەوەی کەسییە سیاسییشە ئەو نەریتە خرایە ژێر پرسیارەوە کە دێت و بە شێوەیەک کە بە لای خۆیەوە گومانهەڵنەگرە جیهان لە ناوەڕاستدا شەق دەکات و دوو لای پیاوانە/گشتیی/سیاسیی و ئافرەتانە/کەسیی/ناسیاسی دروست دەکات. ئەو دەربڕینە بەرەنگاربوونەوەیەکە دژ بە خودی ناوکی ئەو نەریتەی کە هەر لە سەردەمی ئەنتیکەوە پرسگەلی سەبارەت لەش، جنس و پێوەندەجنسیەکان لە گۆڕەپانی سیاسی هاویشتووەتە دەر.

لەسەرەتادا "ئەوەی کەسییە سیاسییشە" بانگێکی نارەزایی بوو لە ناو ئافرەتانی بزووتنەوەی چەپدا. ئەزموونە کەسییەکانی ئافرەتەکان و هەروەها ئەزموونە هاوبەشیەکانیشیان لە گۆڕەپانی "نا ـ سیاسیی" دا لەلایەن هاوڕێ پیاوەکانەوە پشتگوێ دەخرا. پیاوەکان دەیانگوت کە لەبری خەسارکردنی کات بە وردەگلەیی لە ژیانی کەسێتییان، جێی خۆیەتی ئافرەتان خۆ بە شتی "گەورەوە" خەریک بکەن، وەک بۆ نموونە ڕیفۆرمەکردنی سەرمایەداریی یان دەزگای دەوڵەت (Grant 1993). ئافرەتەکانیش بە پێچەوانەوە پێیان دادەگرت کە بێگومان ئافرەتان بە پرسی گرینگەوە خەریکن. پیاوان پێیانەوە دیارە کە دەسەلآتیان لە ئافرەتان زێدەترە و لەبەرئەوەش پێوەندیەکان لە نێوان جنسەکاندا، واتە پیاو و ئافرەتدا، لە ماڵەوە و لە بازاڕییشدا، سیاسیانەیە. کەیت میللێت Kate Millett (١٩٦٩) نووسیویەتی کە سیاسەت هەموو پێوەندیگەلەکان دەگرێتەوە، و ئەویش ئەو واتایە دەدات کە "یەک گرووپی مرۆڤ لەلایەن گرووپێکی دیکەوە کۆنترۆڵ دەکرێن" (1969:23).

بە هۆی وێنە نموونەییەکانی "خێزانی باش – Bra Familjen " ـ ی خۆشبەختەوە کە وردەوردە لە کەنارەوە زیاتر سووان، ئەوا دەرکی فێمێنیزم سەبارەت بە خەسڵەتی سیاسیانەی کەسیی (تایبەتی) بەهێزتر بوو. ئەو بۆچوونانەی کە سەبارەت بە بینینی کەشی خێزان وەک مێرگێکی ئاسوودەگی بە قووڵیی ڕەگیان داکووتا بوو، هێدی هێدی وردبوون و ڕزان. کاتێک کە زانیاری دەربارەی لێدانی

ئافرەت و دەستدرێژیی سێكسیانە لە ناو ماڵدا لە ١٩٧٠ـ كاندا خرایە ژێر تیشكەوە، بە ڕوونی دیار بوو كە خۆشبەختیی كەسیی بە پلەی هەرە یەكەمین بۆ جنسی نێر پارێزرا بوو. كاتێک كە زۆری نەخایاند ڕوون بووەوە كە ترسناكترین شوێن بۆ ئافرەتێک ناو ماڵەكەی خۆی بوو ـ ئەگەر پیاوەكەی لە ماڵ بووایە ـ ئەوان ژیانی خێزان بەو شێوەیەی كە وا پیرۆز كرابوو زیاتر و زیاتر درووەشانەوەی پێشووی خۆی لەكیس دا.

فێمێنیزم بندەستەیی "كەسیی" ئافرەتان لە خانەوادەدا بە دۆخی گیرۆدەبوویی ئەوان لە ناو فەزا گشتییەكەدا دەبەستێەوە. پێوەندی نێوان لە لایەكەوە كۆنترۆڵ كردن و بندەستكردنی ئافرەتان لە ڕووی سێكسیەوە لە كەسێتیەكەی كەشی ماڵەوەدا و لە لایەكی ترەوە ئەوە كە لە سیاسەتدا كەمتر دیارن و كە لە نزمووچەیی و كاری پلەنزمدا زۆرتر دیارن، نیشان دەدرێت. ئافرەتان چۆن بتوانن لە ژیانی سیاسەتدا بەشداربن بە هەمان هەلومەرج كە پیاوان هەیانە لەكاتێكدا كە ئافرەتان نە خاوەنی لەشی خۆیانن و نە ژیانی خۆیشیان؟ یەكەمین هەنگاو بەرەوڕووی گەیشتن بە كۆمەڵگایەكی دیموكراتی و دادوەر، دەبێت دەرككردنی ئەوە بێت كە ئەوەی لە ژووری نووستندا ڕوو دەدات، كێ پارەكەی لە ژێر دەستدایە و كێ منداڵان لە باخچەی ساوایان دەهێنێتەوە، لە ڕاستیدا فاكتەری دەستەڵاتن. ئەوانە پرسیارگەلێكن كە دەبێت بهێنرێنە ناو ڕۆژەڤی سیاسەتەوە. (Philips 1991)

بیریارانی كلاسیكی سیاسیی بیرێكی گەورەیان بەوەوە ماندوو كردوە كە هیچ كام لە خێزان و لە پێوەندیەخێزانیەكان سرووشتێكی سیاسیان نییە. جۆن لۆک John Locke سیاسەتی بەو شتە پێناسە دەكرد كە هیچ پێوەندیەكی بە كەشی خێزانەوە نییە (Okin 1991). ژان ژاک ڕۆسیۆ بە جەسووریەوە هەموو جۆرە ناوەندێتیەكی دەستەڵاتی لە ناو كەشی گشتییدا ڕەت دەكردەوە، و بەڵام هاوكاتیش ڕوونی دەكردەوە كە نابێت دەستەڵاتداریی لە ناو خێزاندا بەش بكرێت. ئەو دەستەڵاّداررییە هەر بە سرووشت هی پیاوان بووە. بیریارە مۆدێرنەكان لەلای خۆیانەوە دەڵێن كە سنووری نێوان كەسیی و گشتیی هێندە ڕوونە كە هەندێک جار خێزان ناهێندرێتە ناو تیئۆریەكانەوە. بە هیچ شێوەیەک خێزان پێویستی بەوە نییە ڕۆشنیایی بخرێتە سەر، لەبەرئەوەی ژیانی خێزان بە سیاسەتەوە پەیوەندار نییە. دەستەڵات سەرئێشەی جیهانی مەزنە، ئەڤین سەرئێشەی جیهانی بچووكە.

كە خێزان و ژیانی ڕۆژانە تێكرا لە تیئۆری سیاسی هاوچەرخ دەردەهاوێژرێن ئەو نیشاندانە ڕادەگرێت كە خێزان دیاردەیەكی سرووشتیی و ناسیاسییە كە پڕبەپڕی پێستی خۆی باشە. لە ڕێگای دەرهاویشتنی پێوەندییە كەسییەكانی ناو ئافرەتان و پیاوان لە كەشی سیاسییدا پیاوان دەتوانن دەستەڵاتی خۆیان بهێڵنەوە. هەروەها لە ڕێگای پشتگوێخستنی كەسییەكە لە ناو توێژنەوەكانی خۆیدا تیئۆری سیاسی خۆی لە هەمان بازییدا دەبینێتەوە. بەو شێوەیە پێ هەڵگرتن لەو بیرەوە كە ئەوی كەسییە

سیاسییە فێمێنیزم ڕەخنەگرە لە هەردوو بۆچوون، لەوەی كە چۆن ئەوی بە كەسیی وەسف دەكرێت و لەو تێگەیشتنەش كە گوایە سنوورێكی سرووشتی و دیار لە نێوان ئەوی كەسیی و ئەوی سیاسییدا هەیە. فێمێنیستەكان دەڵێن هەر كێشانی سنوورێكی لەو شێوەیە خۆی لە خۆیدا ڕەفتارنواندنێكی سیاسییە.

## لێكچوون و ئەقڵ

پێداگرتن كە "ئەوی كەسییە سیاسییە" دەتوانرێت بە گەلێك شێوە لێی تێ بگەیرێت. ئەو پێداگرتنە پەسنی پێوەندیی دوولایەنە و ناكۆكیانەی ئافرەت بۆ سیاسەت دەكات: هاوكات كە ئافرەتان لە كەشی كەسییدا كۆنترۆڵ دەكرێن و دەچەوسێنرێنەوە، ئەوا چۆنیەتی ژیانكردن و ئەزموونی ئەوان وەك سیاسیی نابینرێت. بە پێچەوانەی تیئۆری نەریتییەوە، فێمێنیزم هەموو ئەو شتانەی كە ڕۆژانە دەیكەین دەخاتە ژێرپرسیار و ڕۆشناییان دەخاتە سەر. ئەمەش لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەدا دێتەوە كە نیزامی دەستەڵاتی جنسیی، یان سیستەمی جنسیی، لە هەموو ئاستەكاندا لە كۆمەڵگادا دروست دەكرێت و دەهێڵدرێتەوە. ئێمە چۆن خۆمان فێر دەكەین كە وەك كچان و كوڕان و وەك ئافرەت و پیاو بین، ئەوە بەشێكە لە نیزامی دەستەڵاتەكە. كە كچان لە كوڕان كەمتر قسان دەكەن، كە كچان بە هەستێكی بەخۆباوەڕیی كەمترەوە گەورە دەبن، كە ئارەزوومەندیی كچان بە كەمتر دادەنرێت وەك لە هی كوڕان بەشێكە لە نیزامی دەستەڵاتەكە. (Mansbridge1993)

بەو شێوەیە واتا سیاسیەكە وا لێك دەدرێتەوە كە كولتوری ئێمە تایبەتمەندیی تەواو پێچەوانە بە پیاوان و ئافرەتان دەدات. كە ئافرەتان بە مێژوو ناچاربوون كە نوێنەریی لەش، هاوسۆزیی (ئێمپاتیی) و نائەقڵیی بن، هاوكات كە پیاوان پەتێنتی (تاپۆی) ڕووناكبیریی، ڕەفتارنوێنی و ئاقڵێتیان پێدراوە، بێگومان ئەمە چوونەژوورەوەی ئافرەتانی بۆ ناو كەشی سیاسیی و بۆ ناو دامەزراوە سیاسیەكان زەحمەتتر كردووە. لە سیاسەتدا تا ئێستاش ئەو خەسڵەتانە بەرز دەنرخێنرێن كە بە سەدان ساڵان وا بینراون كە ئافرەتان نەیان بێت.

ئەو گیروگرفتانەی كە فێمێنیزم ئاماژەیان بۆ دەكات تەنیا ئەوانە نیین كە ئافرەتان بە شێوەی جودا ڕێگایان لێ دەگیرێت كە لە ژیانی گشتییدا بەشداریی بكەن. فێمێنیزم تەنانەت هەر خودی ناوەڕۆكی چەمكی سیاسەتیش كە چی دەگرێتە خۆی و چی دەردەهاوێژێت دەخاتە ژێرپرسیار و شی دەكاتەوە. تێگەیشتنە نەریتیەكە لە سیاسەت ئەوە فەرامۆش دەكات كە پێوەستە بە جنس، لەش، هەست و سێكسەوە. لەش و جنسی ئێمە وەك كەسیی تێی دەڕوانرێت و لەبەرئەوەش لە ڕووی سیاسیەوە بێبایەخ دەبینرێت. گۆڕەپانە سیاسیەكە بە گۆڕەپانی ئەقڵ دادەنرێت.

لەوێدا جنس پۆلێکی (کەتەگۆریەکی) ڕەوای سیاسیی نییە. لەوێدا جنس شتێکە کە ئێمە دەبێت لە کاتی ئازاددا خەریکی بین.

دیتنی سیاسەت وەک شتێکی لە ڕەگەوەجودا لە لەش و لە هەست و لەو زێدەباوەڕەی کولتوری سیاسیدا بە ئەقڵی مرۆڤ، ڕەگی داکوتاوە. هەموو مرۆڤێک چاوەڕوانیی لێ دەکرێت کە بە هەمان شێوە و بە لۆژیکێکی لێکچوو بتوانێت ئەنجامگیریی دەربارەی باشێتیی گشتیی بکات. ئەم دیتنە بە مانای ئەوە دێت کە هەموو جیاوازیەکانی نێوان مرۆڤەکان دەبێت جێ بهێڵدرێنە لای ئەوی کە کەسییە. بەو شێوەیە وەک ئەکتێورگەلێکی سیاسی چاوەڕوانیمان لێ دەکرێت کە ڕووانگەیەکی باشێتیی گشتییمان هەبێت، لەوێدا خودی کەسییمان دەردەهاوێژرێت. ئەزموونی سەربەجنسێکی تایبەتیی، هۆمۆسێکسیوالیی، یان هەبوونی ڕەنگێکی تایبەتی پێست یان کەنەفتێتی هیچیان بایی ئەوەندە نیین کە بلیتی چوونەژوورەوەیان بۆ ناو سیاسەت پێ بدرێت. (Young 1987)

بەو شێوەیە فێمێنیستەکان هەردوو دەخەنە ژێرپرسیارەوە، هەم ئەوەی کە کام پرسیارانە بۆیان هەیە لە ئاجێندای (ڕۆژەڤی) سیاسییدا بەرز بکرێنەوە و کێ بۆی هەیە لە گەمەکەدا بێت، و هەم ئەوەش کە *بە چ شێوەیەک* ئێمە دەتوانین لە پرۆسێسە سیاسیەکەدا بەشدار ببین. ئەو بیرەی کە گوایە سیاسەت دەبێت لەسەر بناخەی لێکچوون و ئەقڵ بناخە دابنێت وا دەکات کە ئێمە دەبێت بە تایبەتمەندێتیی هاوولاتیی ئەبستراکتەوە لە سیاسەتدا بەشدار بین، نەک لە تایبەتمەندیی مرۆڤییدا بە جیاوازیی لەشیی و جنسییەوە.

مۆد ئێدواردس (Maud Edwards 1992) ئاماژە بەوە دەکات کە چ گۆڕەپانێکی سیاسی لە گۆڕێدا نییە کە مامەڵە لەگەڵ ململانێی جنسییدا بکات. نیزامەسیاسیەکە لەسەر ئەوە بنیات نراوە کە ئافرەتان و پیاوان پێکەوە خۆیان ڕێک بخەن، بێ ڕەچاوکردنی جنس. ئەمەش لەسەر ئەو پێوابوونە بناخەی داکوتاوە کە گوایە پێوەندی نێوان جنسەکان بێ ململانێیە. سیاسەتی ڕەوا لەبریتی ئەوە لەسەر ڕەهەندی چەپ ـ ڕاست دەهۆندرێتەوە. ئافرەتان ڕێگایان پێ نادرێت کە *وەک ئافرەت*، وەک یەک گرووپ بە بەرژەوەندی خۆیەوە، بەشداریی لە سیاسەتدا بکەن. ئافرەتان لەژێر ئەو مەرجەدا بۆیان هەیە بەشدار بن کە وەک تاکەکەس بەشدار بن، نەک وەک کۆمەڵێکی سیاسیی.

بەو شێوەیە ئافرەتانێک کە لە دەرەوەی سیستەمە سیاسیە داکووتراوەکەدا بە یەک دەگەن و خۆیان ڕێک دەخەن، بەرەنگاری نیزامە لە ئارادابووەکە دەبنەوە. کاتێک کە ئافرەتان پێ دادەگرن کە ئەوان بەرژەوەندی سیاسیان هەیە لەبەرئەوەی کە ئافرەتن، ململانێ جنسیەکە دەردەکەوێت ـ و بەو شێوەیەش پەیوەندگریی جنسیی پیاوانیش دەکەوێتە بەر چاو. کاتێک کە ئافرەتان وەک گرووپێکی سیاسی خۆیان دەپێناسێنن پیاوانیش دەبن بە گرووپێک. تاکەکەسە ئەبستراکتەکە و ویستە

گشتییەکەی ئیعتیباریان (برەویان) نامێنێت ـ هاوکات کە سنووری نێوان لەشە کەسییەکە و ئەقڵە گشتییەکە دووچاری دژبەیەکبوون و ڕووبەڕووبوونەوە دەبێت. (Eduards 1993)

> گرووپەگەل دروست دەکردرێن لەبەرئەوەی کە ئافرەتان داوای تایبەتییان هەیە، *بەڵام هێزە سیاسیە تەقنینەرەوەکەیان لەو ڕاستیەدایە کە خودی ئەو جۆرە دامەزراندنەیان ڕەهەندەجنسییەکە دەخاتە بەرچاو.* ئافرەتان وەک ئافرەت دێنە پێش و لەگەڵ بەرانبەرەکەیاندا داوای ئاخافتنێک دەکەن. پەسەندکردنی ئەم داوایە بۆ پیاوان وەک ئەوە وایە کە ددان بەوەدا بنرێت کە پەیوەندگریی جنسیی ئافرەتان واتایەکی سیاسیی هەیە. ئەو لەشەی کە لە مێژە نکۆڵی لێ دەکردرێت، کە هێمای جودایی و هەستیی لەکۆنترۆڵنەهاتە، بەو شێوەیە خۆی دەکات بە ناو شانۆی سیاسەتدا. ئاخافتنە سیاسییە ئەقلانییەکە بەو شێوەیە لەق دەبێت و دەکەوێتە لەرزە. ( Eduards 1993:106f)

## سێکسیوالێتی، دەستەڵات و دایکایەتیی

کە سنوورکێشیی نێوان ئەوی کەسییە و ئەوی گشتییە نیزامی دەستەڵاتیی جنسیی دەهێڵێتەوە شتێکە کە زۆربەی فێمێنیستەکان لەسەری ڕێکن. گەلێک کەس ئاماژە بەوە دەکەن کە سنوورەکان بۆ هەر جنسێک دیاری دەکرێن و کە فەزا پیاوانەکە هەر ڕاستەوڕاست بڵندتر وەک لەوی ئافرەتان هەڵ دەسەنگێندرێت. هەروەها یەکڕاییەکی (هاوڕاییەکی) گەورەش لەسەر ئەوە هەیە کە ئەوی لە دۆخە کەسییەکەدا بە شێوەی جودا ڕوو دەدات دەشاردرێتەوە و کە دەبێت سنووری نێوان ئەوی کەسییە و ئەو سیاسییە خاو بکرێتەوە. بەڵام کە بیریارانی جودا چۆن دەخوازن گرفتەکە چارە بکەن شێوەی جودای هەیە. لە بناخەدا ئەو شێوە جودایییە دەربارەی شێوازی جودایە بۆ شیکردنەوەی ئەوی کەسییە.

فێمێنیستەڕادیکالەکان دەڵێن کە کەشە کەسییە خێزانییەکە مۆرکی زەبروزەنگ و دەستدرێژیی دژ بە ئافرەتانی هەڵگرتووە. چەوساندنەوەکە لە پێوەندیە کەسییە سێکسیەکەدا ڕەگی داکووتاوە (بەراووردی لاپەڕەی ٣٧ بکە). لە پێوەندی سێکسیی نێوان پیاوان و ئافرەتاندا زەبروزەنگە سێکسیەکە ناوەندە. ئەو زەبروزەنگە لێدان و زەوتکردنی سێکسی و پۆرنۆگرافیی و لەشفرۆشیی و دەستبۆبردنی سێکسیش دەگرێتەوە. بیرەبنچینەییەکەی فێمێنیستەڕادیکالەکان ئەوەیە کە دەڵێن ناکرێت زەبروزەنگە سێکسیەکە وەک "جودا" و "نائاسایی" ببینرێت. ئەوان جیاوازی لە نێوان پێوەندیەکی زەبروزەنگدار و پێوەندییەک کە زەبری فیزیکی تیایدا نەبێت وەک

پلەجودایی دەبینن نەک وەک شێوەجودایی. سێکسە پیاوانەکە لە میانەی جودادا لە دەوری زەبروزەنگ، هەر لە نیشاندانی پیاوەتیەوە بە ڕەقێتی و توندوتیژیی تا دەستدرێژیی خووگرتوانە، دەهۆندرێتەوە. ئەوان پێیان وایە کە ماسولکەداریی، زەبروزەنگ و سێکسوالیتیتی زۆر نێزیکانە پێکەوە گرێدراون.

> واتای پیادەکردنی زەبروزەنگی سێکسی نابێت نە وەک زەبروزەنگ و نە وەک سێکس، پۆلێن بکرێت. ڕۆڵی سێکسی پیاوانە [...] لە تێترانجاندنێکی زەبرئامێزانە لە کەمتر دەستەڵاتداراندا خۆی خولاسە دەکات. ئەم ئاکارە باڵزاڵییە وەک هەوەسهەستێنەرێکی سێکسیی، وەک خودی سێکس خۆی، بە ئەزموون کراوە. (MacKinnon 1989a:316)

ئێڤا لوندگرێن دەنووسێت کە کاتێک پیاوێک لە ئافرەتێک دەدات ئەوا ئەو لە ناوەوەی سنوورەجنسیەکەی کولتوری خۆیدا ڕەفتار دەکات. "پیاوان زۆر زێدەتر دەبنە نێر کاتێک کە ئافرەتان توند دەگرن" (1990:13). هاوکات کە سێکسیوالێتی پیاوان بە باڵادەستی و کۆنترۆڵەوە بەستراوە، ئەوا سێکسوالێتی ئافرەتان لە تێرمی بندەستیی، بێدەستەڵاتی و لەبەردەستبووندا بۆ پیاوان دەفۆرمێندرێت. کاتلین بارری Kathleen Berry (١٩٩٥) لەسەر چەوساندنەوەیەکی گەردوونیانەی ئافرەتان دەدوێت. ئەم چەوساندنەوەیە لە بازرگانییکردن بە لەشی ئافرەتان و لە لەشفرۆشیی و پۆرنۆگرافییدا بە ڕوونترین شێوە دەردەکەوێت، بەڵام ئەم چەوساندنەوەیە لە بناخەدا ڕەنگی هەموو شێوەکانی پێوەندیە سێکسیەکانی نێوان پیاوان و ئافرەتان دەداتەوە. ئافرەتان دەهێندرێنە خوارێ بۆ تەنیا لەش، ئافرەتان دەکرێن بە شت، تەنیا بۆ ئیرزاکردنی (ڕاحەتکردنی) پیاوان.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە باسکردنانەی هێترۆسێکسوالیی وەک دەربڕینێک بۆ چەوساندنەوەی ئافرەت، بەوەی کە نامێژوویی و ناڕۆشنن، ڕەخنەیان لێگیراوە. ڕەخنەگران لەم جۆرە بیرە دەڵێن ناتوانرێت سێکس هەر ئاوا یەکلایەنیانە پەسن بکرێت. ئافرەتان ئەزموونی جودایان لەسەر سێکس هەیە و سێکسیش لە کات و کولتوریی جیاوازدا بە شێوەی جودا پیادە دەکرێت.

هەروەها توڕدانی بێهەلومەرجی پۆرنۆگرافیی کە ڕادیکالفێمێنیستەکان پێی لەسەر دادەگرن خراوەتە ژێر پرسیارەوە. ڕەخنەگران لە بیری ڕادیکالفێمێنیزم دەڵێن پۆرنۆگرافیی دەتوانێت، ئەگەر بە پێی هەلومەرجەکانی ئافرەتان بکرێت، ڕێگایەک بێت بەرەو سەرفرازیی. پۆرنۆگرافیی دەتوانێت یارمەتی ئافرەتان بدات کە لە سێکسیوالیی خۆیاندا قووڵتر ببنەوە و وای لێ بکەن کە ڕێگاپێدراو و بینراو بێت لە جیاتی ئەوەی کە جێی شەرم و تابو لەسەردانراو بێت (Eisenstein 1988). هەندێک بیریار وای بۆ دەچن کە کاتێک زێی ئافرەت لە پۆرنۆگرافییدا نیشان دەدرێت، لە

ڕێگای ئەوەی کە پێی دەگوترێت "زمانی وێنەیی زێ vaginal imagery، دەتوانێت دەورێکی فێرکردنانە و زانیاریبەخشانەی هەبێت. هەروەها ئەم وێنانە وا دەکەن کە جنسی ئافرەت سەیر نەنوێنێت، تاوەکو "ئەو بۆساردە کە بە سەیر دادەنرێت لە لووت دەرچێت کە لە حەشاردانی سەدانساڵەی کوزدا لە ئەدەبی بەربڵاوی خۆرئاواییدا هەیە" (Ellis 1992:165).

گەلێک فێمێنیستی لێسبیست (هاوجنسباز) دەڵێن کە ئەگەرچیش زەبروزەنگ ڕاستەوخۆ بەشێکی هێترۆسێکسیوالیتی نییە، بەڵام لەوێدا سێکسیوالیتی هەر لە ڕووانگەی مەرجگەلیی پیاوانەوە پێناسە کراوە و هەر دەستەڵاتی پیاوان لەسەر ئافرەتان دادەکوتێت. فێمێنیستە لێسبیستەکان بەو جۆرە هێترۆسێکسیوالیتی وەک دامەزراوەیەکی سیاسیی دەخەنە ڕوو، کە هەم لەلای پیاوانەوە و هەم بۆ ئەوان بنیاتنراوە. بەو شێوەیە هێترۆسێکسیوالیتی لەسەر نیشاندانی جیاوازیی "سرووشتییانەی" نێوان جنسەکان دامەزرێندراوە. ئەم جیاوازییە سرووشتییانە لە ڕاستییدا پەردە بەسەر جیاوازیەکانی دەستەڵاتدا دەدەن. پیاوان دەتوانن لە هەموو ڕوویەکەوە بەسەر ئافرەتاندا زاڵ بن. پیاوان دەبێت زیاتر پارەیان دەست بکەوێت، درێژتر و بەتەمەنتر بن، خوێندنێکی باشتریان هەبێت و پلەیەکی باڵاتری کۆمەڵایەتییان هەبێت. خۆشویستنی هێتروسێکسیوالیتی خۆی لە خۆیدا لەبەر ئەم جیاوازیانەیە. لەبەرئەوە پێوەندیە هێترۆسێکسیوالیتیەکان هەرگیز ناتوانن یەکسان بن. (Jeffreys 1994)

> بە دڵنیاییەوە هەندێک جێگەی سەرسوڕمان دەبێت، ئەگەر، لەم دۆخی نایەکسانییەدا کە زۆر بە وردیی بنیات نراوە، هەوەسی (وروژاندنی) سێکسی پیاوان بۆ ئافرەتان بە بەرابەرییخوازی ساخ بێتەوە. بێگومان وا نییە. پیاوان پێویستیانە ئارەزوویان بچێتە سەر ئەو ئادەمیزادە بێدەستەڵاتانە کە دەیانهێنن (مارەیان دەکەن). بەو شێوەیە ئارەزووی هێترۆسێکسیوالیی پیاوان لەسەر بە خۆش و لووسکردنی جوداداناني ئافرەتان دامەزراوە، جوداداناێک کە لەسەر جودایی دەستەڵات دامەزراوە. (1994:63 Jefferys)

هێترۆسێکسیوالیی بە شێوەیەکی وا هۆنراوەتەوە کە ژێردەستەیی ئافرەتان دەهێڵدرێتەوە. چەوساندنەوەی ئافرەتان بە سێکس (یی) ناو دەبردرێت و بەو شێوەیە جۆرێک لە پلەی بایۆلۆژیی، سرووشتیی و ئاسایی وەردەگرێت. پێوەندیە دەستەڵاتگەریەکان ئاوا لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا چالاکانە دەشاردرێتەوە. بەو جۆرە بندەستێتی ئافرەتان وەک نیزامێکی سرووشتیی دەخرێتە بەر دەست، نەک وەک نیزامێک کە لەلایەن دەستەڵاتی سیاسییەوە دروستکراوە.

ئادریانا ڕیچ Adrienne Rich (١٩٨٠) دەڵێت کە دامەزراوە هێترۆسێکسیوالیتیەکە بەو مانایە دێت کە نکۆڵی لە هاوبەشێتیەکانی ئافرەتان دەکردرێت و ڕێگایان لێ

دەگیرێت. ئادریانا لەسەر پێکەوەبەندیەکی لیسبیستیی دەدوێت، کە هەر بە تەنیا پێوەندیی سێکسیی ناگرێتە خۆی. ئەزموونە جوداکانی ئافرەتان و ئەو چڕی و هێزەی کە لە نێوان ئافرەتاندا هەیە، لە ژێر قورسیی هێترۆسێکسیوالییدا لە ناو دەچێت. پێوەندییە لیسبیسیەکە وەک ڕێگایەکی شیاو باس دەکرێت کە ڕۆشنایی بخاتە سەر هێترۆسێکسیوالیتی وەک نۆرم و بەو شێوەیە بناخەی سەرەکی نیزامی دەستەڵاتی جنسیی بخاتە ژێر پرسیارەوە. لە ڕێگای لادان لە نۆرمەکە، ئەوا ئەڤینە لیسبیستیەکە دەتوانێت زیاتر نۆرمە هیترۆسێکسیوالیەکە بخاتە بەر چاو. ئەڤینی هۆمۆسێکسیوالیی (هاوجنسبازیی پیاوان) بەرەنگاری پایەی هێترۆسێکسیوالی دەبێتەوە کە وەک ناچار و ئاسایی دادەنرێت، و لە درێژخایەندا دەتوانێت ئەو چەوساندنەوە ئاساییە ببەزێنێت. ڕەهەندە سیاسیەکە دەبێت بە بەشێکی گرینگ لەو شتەی کە بە مانای لێسبیسبوون دێت.

بە پێی فێمێنیستە لێسبیستەکان، ئەو ڕاستییەی کە ئافرەتان پێوەندی سێکسیی لەگەڵ پیاواندا بەرز دەنرخێنن، بەو مانایە نایەت کە هێترۆسێکسیوالیتیی بێ گیروگرفتە و سەمای ناو گوڵوگوڵزارە. ئێڤا کریستۆنسۆن Eva Christenson (١٩٩٤) دەڵێت کە هێترۆسێکسیوالیتی لەسەر دوو ئاست هەیە. ئەوە گرینگە کە جیاوازیی لە نێوان هێترۆسێکسیوالیتی وەک ئەزموون و هێترۆسێکسیوالیتی وەک دامەزراوە بکرێت. کە ئافرەتان ئەزموونی پۆزەتیڤی سێکسیان لەگەڵ پیاواندا هەیە ئەو بەرەنجامە نابەخشێت کە ڕەخنە لە هێترۆسێکسیوالیتیی کە وەک زۆرەملێ و وەک دامەزراوەیەکی نۆرمدەر دەبینرێت، بێ ڕەواج بێت.

فێمێنیستە ڕادیکالەکان و لیسبیستەکان تێکڕا پێیان وایە کە مەرجگەلی بەرابەریی ڕاستەقینە ئەوەیە کە پێوەندی نێوان سێکس، زەبروزەنگ و چەوساندنەوەی ئافرەت بخرێتە بەر چاو. هەرە ئەو شتەی کە کەسی و تایبەتە دەبێت بەو شێوەیە بە سیاسیی بکردرێت و ددان بە بوونی زەبروزەنگ لە ناو پێوەندییە نێزیکیەکانی مرۆڤەکاندا بنرێت، و بخرێتە ژێرپرسیار و وتووێژی لەسەر بکرێت.

بیریارانی دیکە، کە ئێمە پێمان خۆشە ناویان بنێین بیریارانی دایکایەتی motherhood theorists، ئەوانیش هەر دەڵێن کە ئافرەتان ڕێگایان پێ نادرێت لە بەشی گشتییدا بەکار بن، بەڵام ئەوان ئەو وەسفکردنە قبووڵ ناکەن کە ئافرەتان هەر ئەوە بن کە قوربانیی دەستەڵاتگەریی پیاوان بن. بەپێچەوانەوە ئافرەتان توانیویانە لە کەسێتیەکەدا دەسەلاتگەریی بکەن و کولتورێکی خۆیان بە بەهاگەلی خۆیانەوە دابڕێژن (Elshtain 1981). ئەم کولتووره ـ ئافرەتییە لەو پەڕییدا لەسەر ئەو بناخەیە دامەزراوە کە ژنان منداڵیان دەبێت. کاتێک ژنێک دەبێت بە دایک خۆپەرستییەکە خۆی دەدات بە دەست دڵنەوازییەوە. بەو شێوەیە لە جیهانی ئافرەتدا تایبەتمەندێتیی بۆ هاوهەستی و بەخێوکاریی دەچێندرێت. ئافرەتان لە

ڕێگای ڕۆڵی نەریتیی خۆیانەوە وەک دایکایەتیکردن، باوەشنەوازیی و نێزیکایەتیی ڕەووشتێکی تایبەت بە خۆیانیان دروست کردووە، کە کەشە گشتییەکە دەبووایە کەڵکی لێوەربگرێت وەک لەوەی لە دەرەوە بیانهێڵێتەوە. (Ruddick 1989)[1]

بیریارانی دایکایەتی دەڵێن ئیدی کەواتە لە ڕاستییدا دیاردە کەسییەکە (تایبەتییەکە) گرفتەکە نییە، بەڵکو دیاردە گشتییەکەیە کە گرفتە. ئەو سنووربەندیە کە بەرانبەر ژیانی خێزان کراوە سیاسەت و سفارە گشتییەکەی لاواز و بێسۆز کردووە. لە کەشە سیاسیەکەدا ڕێگا بە بەرژەوەندی کەسیی دەدرێت و شتپەروەرییەکی (کالآپەروەری) ڕەق بێ هیچ سنووربەندییەک لە ئارادایە. ستراتیژییە فێمێنیستیەکە کە خوازیاری دانانی نیشانەی یەکسانییە لە نێوان کەسیی و گشتییەکەدا ئەوا بەم شێوەیە لەم ڕووانگەیەوە تێکدەرە (Elshtain 1981). ئەگەر هەموو شتێک ببێت بە سیاسەت، هەموو شتێک دەبێت بە کێبڕکێیەکی خۆپەرست کە هەمووان بەرەوڕووی یەک دەبنەوە. لەبری ئەوە، لە بۆچوونە دایکایەتیەکەدا، پێشنیاری ستراتیژیەکی پێچەوانە دەکردرێت. لە ڕێگای ئەوەوە کە ڕێگا بدرێت ئەوی کەسییە کار بکاتە سەر ئەوی گشتییە ئەوا ڕەووشتە سیاسیەکە ڕادیکالانە نوێ دەکردرێتەوە. *بیری منداڵنەوازی* (دایکێتیکردن) Maternal thinking، کە جۆرە بیرێکی مۆدێرنە، جێی خۆیەتی ڕێگای بدرێت سنووری نێوان کەسیی و گشتیی ببەزێنێت. ئەمە دوو جۆرە قازانجی دەبێت: کەشە سیاسیەکە بە مرۆڤیی دەکرێت و ئافرەتانیش ڕێگایان پێ دەدرێت کە بە تەواوی لە کاروبارییی دەوڵەتییدا بەکار بن (Ruddick 1989)[١].

بەڵام فێمێنیستانی دیکە ڕەخنە لە بیریارانی دایکایەتی دەگرن و دەڵێن ئەوە خۆگر نییە کە قسان لەسەر ئەزموونێکی هاوبەش یان ڕەووشتێکی هاوبەش بۆ هەموو ئافرەتان بکرێت. هەموو ئافرەتێک نابێت بە دایک و هەروەهاش بوون بە دایک لە دەمی جودای کولتوریی و مێژووییدا بە مانای جیاواز دێت. بەرپەچدانەوەیەکی دیکەی ئەو فێمێنیستانە ئەوەیە کە بیریارانی دایکایەتی بەو شێوەیە هەر ئەو وێنە نەریتیانەی (ستێریۆتایپانە) ئافرەتانی سەرپەرشتیار و خۆڕەتێنەر بەهێز دەکەن کە نیزامی دەستەڵاتی جنسیی خۆی دروستی کردووە. ئینجا دەڵێن هەر دروستیش وەک کاردانەوەیەک دژ بەم ڕۆڵە سنووردارکراوەی ئافرەتان بوو کە فێمێنیزم سەری هەڵدا (Grant 1993:71).

## دەوڵەت و جنس

ئەو فێمینیستانەی کە ئەو بیرە دەخەنە ژێرپرسیار کە ئازادیی لەلایەن خێزان و دایکایەتیەوە فەراهەم دەکرێت بەگشتیی زۆرتر ڕووی خۆیان دەکەنە دەوڵەت. ئەوان بەڵگە دەهێننەوە و دەڵێن لای دەوڵەت ئەو یارمەتییە دەست دەکەوێت کە ئافرەت بتوانێت لە وابەستەیی و شکاندنی ناو فەزا تایبەتیەکە دوور بکەوێتەوە. دەوڵەت، بەتایبەت دەوڵەتە خۆشگوزەرەکانی (ڕەفاهیەکانی) سکەندناڤیا، سەربەخۆیی ئافرەتانیان بەهێزتر کردووە. لە ڕێگای گەشەی کەرتی دەوڵەتییەوە ئافرەتان کاریان چنگ کەوتووە. لەو ڕێگایەوە ئەوان، لانی کەم لە ڕووی ئابوورییەوە، دەستیان کردووە بەوەی کە خۆیان لە وابەستەبوون بە پیاو ڕزگار بکەن. دەوڵەتیش هەورەوها لە ڕێگای سیستەمی چاودێریی منداڵآن و دەرماڵە و سیگورتەی دایکوباوکایەتییەوە هەلی بۆ ئافرەتان ڕەخساندووە کە بتوانن کاری خۆبژێوی بکەن. هەروەها ڕیفۆرمی یاسایی جوداش خراوەتە کار تا ئافرەتان لە زەبری پیاوان بپارێزرێن.

ئەم ڕیفۆرمانە وا دەکەن کە دەوڵەت بە زۆریی وەک لایەنگرێکی گرینگ لە خەباتی بەرابەرییدا دەبینرێت. بەو شێوەیە قسە لەسەر دەوڵەتی ئافرەتپەروەر دەکرێت و پێوەندی نێوان دەوڵەت و ئافرەتان لەلایەن هەندێک فێمێنیستەوە وەک هاوپەیمانیەک لە قەڵەم دەدرێت. ئافرەتان و دەوڵەت بە دانووستاندن گەیشتوونەتە کۆنتراکتێک کە هەردوولایان لێی ڕازیین. بەو شێوەیە کەرتی دەوڵەتی و ئافرەتان سوودیان لەیەک وەرگرتووە. کەرتی دەوڵەتیی بۆ پتر گەشەکردنی خۆی پێویستی بە هێزی کاری ئافرەتان بوو و ئافرەتانیش بۆ ئەوەی کارێکیان چنگ بکەوێت کەرتی دەوڵەتییان پێویست بوو (Hernes 1987).

ئەو لێکۆڵەرانەی کە ولآتانی باکوورییان لەگەڵ بەشی دیکەی جیهاندا بەراوورد کردووە بەزۆریی دەگەنە ئەو سەرئەنجامەی کە مۆدێلی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی ناوەندیی سوێدیی دەستکەوتی سەرسوڕهێنەری بۆ ئافرەتان وەدەست هێناوە.٢ لە دەوڵەتی خۆشگوزەرانییدا بەلانی کەم هەندێک پرس؛ وەکو پرسی منداڵپەروەریی و زەبروزەنگ و دەستدرێژیی سێکسیی دژ بە ئافرەت، کە لەوەبەر وەک کاروباریی کەسیی خێزانیی دادەنران، ئێستا سیاسەتێندراون؛ لە ڕێگای چەندین ڕیفۆرمەوە هەلی ئافرەتان بۆ پێکەوەگرێدانی کار و دایکایەتی کردن شایانباسانە باشتر بووە، و پارێزەی دژ بە هەڵاواردنی جنسییش بەهێزتر کراوە (Borchorst & Siim 1987).

هاوکات گەلێک فێمێنیست بەگومانەوە لە دەوڵەت دەڕوانن. ئایا بەڕاستی دەوڵەت دەرفەتێک بەرەو قووتاربوون لە بندەستیەکە فەراهەم دەکات یان لەڕاستیدا خودی دەوڵەت هەر خۆی هەڕەشەیەکە لە خەباتی ئافرەتان ڕووەو بەرابەریی؟ گەشەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیی بە بەرچاوەوە وابەستەیی ئافرەتانی بە پیاوانی

تاکەوە کەم کردووەتەوە، بەڵام لەبری ئەوە ئافرەتان بوون و کراون بە وابەستەی دەوڵەت. ئافرەتان دووجار وابەستەی کەرتی دەوڵەتیین. ئەویش ئەوەیە کە لە پیاوان زیاتر تامی لێ دەیچێژن، چ وەک خزمەتکراو و چ وەک کارمەندیش. سەرەڕای ئەوەش هێشتا تا ڕادەیەکی باڵا هەر پیاوانن بڕیار دەدەن، هەم وەک سەرۆک و هەم وەک سیاسەتمەداریش (Hernes 1987). ئافرەتپەروەریی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیی سنوورێکی ڕوونی هەیە. ئافرەتان زیاتر و زیاتر هەلیان بۆ نفوزی (دەستڕۆیووی) سیاسیی جیدی لێ دەستێندرێتەوە. ئافرەتان ڕێگا نادرێن کە سەربەخۆییانە لە سیاسەتدا بەشدار ببن و بە پێی خۆیان گوزارە لە خۆیان بکەن ( Borchorst & Siim 1987).

بەڵام فێمینیستانی بیریارانی دەوڵەتیی Feminist thorists of the state بەزۆریی خۆدەپارێزن لەوەی کە دەوڵەت تەنیا بە باش یان بە بەد، بە دۆست یان دوژمنی ئافرەتان بخەسڵەتێنن.

پرسیار سەبارەت بەوەی کە دەوڵەت ئازادکارە یان جڵەوگر ناتواندرێت بە بەڵێیەک یان بە نەخێرێکی ڕوون وەڵام بدرێتەوە (Watson 1990). درود داهلڕوپ Drude Dahlerup پێی وایە کە لەبری ئەوەی پێ دابگیرێت کە دەوڵەت لە ڕاستییدا چۆنە یان چییە، جێی خۆیەتی پێوەندیی نێوان ئافرەتان و دەوڵەت لە دۆخی جودای کۆنکرێتدا بخوێندرێت (Drude Dahlerup 1994). ئەو ئاماژە دەکات کە هەروەها تەنانەت لە توێژینەوەی ڕیفۆرمیی تاکیشدا زەحمەتە بگوترێت کە چی لە ڕاستییدا ئازادکار یان چەوسێنەرەوەیە بۆ ئافرەتان. بە پێی ڕووانگەی پێهەڵگرتنی جودا فێمێنیستەکان دۆخەکە بە شێوەی جودا شی دەکەنەوە، و ئەوەش هەروەها جێی تێگەیشتنە کە هەنگاوی دەوڵەتیی بە شێوەی جودا کار دەکاتە سەر گرووپی جودای ئافرەتان.

لە لێکۆڵینەوەی ئەوەی کە پێی دەگوترێت فێمۆکراتەکان، واتە بیرۆکراتی فێمێنیستیی، سەرنجی توێژەرەوە لە دەرئەنجامی ڕیفۆرمی دەوڵەتیی لادەچێت و دەخرێتە سەر کاری مرۆڤیی ناو ستروکتوورە دەوڵەتییەکان. لێرەدا ئەو تواناکارییانە دەخوێندرێت کە ئافرەتان بۆ وەدەستهێنانی شوێنی خۆهەڵسوڕان لە ناو نیزامە بیرۆکراتییەکاندا هەیانە. بیرێکی خۆگر ئەوەیە کە ئافرەتانی ڕادیکاڵ، کە ستراتیژیانە لە ناو پێگەی دەوڵەتییدا دانراون، دەتوانن شوێن بۆ گۆڕانکاریی پڕمانا لە هەلومەرجی ئافرەتاندا بدۆزنەوە. لەڕێگای هاوپەیمانێتیەوە، هەم لە ناو و هەم لە دەرەوەش، چ لەگەڵ فێمێنیستیی گەلیی و چ لەگەڵ سیاسەتمەداری شوێنگرتوو و بیرۆکراتاندا، ئافرەتان بەزۆیی لە بەکارهێنانی دەوڵەتدا بۆ گەیشتن بە مەرامگەلی خۆیان سەرکەوتوو دەبن (Eisenstein 1995).

بەڵام تێگەیشتنێکی وا لە تواناکاریی ئافرەتان کە بێن و بتوانن ستروکتوورەکانی دەوڵەتی و بیرۆکراتیی بەکاربهێنن لە تیئۆریی فێمێنیستی

ڕادیکالدا بەرپەچ دەدرێتەوە. فێمێنیستە ڕادیکالەکان دەوڵەت زیاتر لە هەر شتێک وەک ئامێرێکی ناو دەستی پیاوان دەبینن.

> دەوڵەت لە مانای فێمێنیستیدا نێرە: یاسا بە هەمان دیدەوە ئافرەتان دەبینێت و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات کە پیاوان دەیان بینێت و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. (MacKinnon 1989b:161 f)

بیرەکە ئەوەیە کە دەوڵەت شێوە بە نۆرمی پیابوون دەدات. دەوڵەت لەو میکانیزمگەلە چەوسێنەرەوەی کە کەرتی کەسییەکە بەڕێوە دەبات بێگوناهـ نییە. بە پێچەوانەوە، خەسڵەت و دامەزراوەی دەوڵەت ڕەنگی نیزامی دەستەڵاتە جنسییەکە دەداتەوە. هەموو هەنگاوەچارە دەوڵەتیەکان و هەموو ڕیفۆرمە سیاسیەکان دەبنە مایەی بندەستخستنی ئافرەتان، تەنانەت ئەگەرچیش هەمیشە ڕوون نیین.

جوان ئاکەر Joan Acker پێ دادەگرێت کە ئەو ڕێکخراوە فێمێنیستیانەی کە ڕێگا بەخۆیان دەدەن هاوکاریی نێزیکیان لەگەڵ دەوڵەتدا هەبێت خۆدەخەنە ئەو مەترسیەوە کە هێزی ڕاتەکێنەری سیاسی خۆیان لەدەست بدەن (Joan Acker 1995). ئەگەر گرووپەکان لە ڕوویی ئابووریەوە وابەستە ببن، ئەوا دەوڵەت دەتوانێت لەسەریان داواخواز بێت کە کاروبارەکان چۆن ڕێک بخرێن و کە کام گرفتانەش سەرنجیان بدرێتێ. ئەمە ڕێکخراوگەلی فێمێنیستیی دەخاتە دۆخێکی سەرلێدەرنەکراوەوە. کۆمەکە دەوڵەتیەکە هەڕەشە لە لەگۆڕنانی ڕادیکالییێتی ناو کاروبارەکان دەکات، هاوکات کە گرووپەکان خۆیشیان بۆ بەردەوامبوون لەسەر ژیان وابەستەی پارەکان دەبن. "سەرئەنجام، لە درێژخایەندا، ڕێسا بێدەنگەکە بۆ ئەوان ئەمەیە: 'خۆ بگونجێنە یان بمرە'" (Acker 1995:140).

دەوڵەت داوای سیاسیی ئافرەتان، لە ڕێگای تێپەستانیان لەناو خودی نیزامە سیاسیەکە، لەپەلوپۆ دەخات. پاتریشیا مۆرگان (Patricia Morgan 1982) مەبەستێتی کە ئەم هەڕەشەیە هەمیشە لەبەردەم بزووتنەوەی ئافرەتانە، تەنانەت ئەو بەشەش لە بزووتنەوەی ئافرەتاندا کە جەخت لەسەر ڕێکخستنێکی جودا دەکات. نموونەیەک بۆ ئەمە بزووتنەوەی ئافرەتانی ئەمەریکایە، بزووتنەوەیەک کە لە سەرەتادا پێکهاتبوو لە گرووپی بێلایەنی سیاسی و فێمێنیستیی ڕوون. بەڵام هێدی هێدی بزووتنەوەکە لە لایەن دەوڵەتەوە دەستی بەسەردا گیرا. بنکە ئێشکگرەکان کە ئافرەتان خۆیان دەیانبرد بەڕێوە لە بەرانبەر ئەوەدا کە ڕێگایان بە چاودێریی دەوڵەت داو و ڕێکخراوەکانیان بەو شێوەیەی دەوڵەت دەیخواست دووبارە ڕێکخستنەوە دەستیان کرد بە پارە وەرگرتن. بەڵام کاتێک دەوڵەت دەستی خۆی خستە کارەکانەوە نە هەر بە تەنیا ڕێکخراوەکە هێدی هێدی گۆڕدرا، بەڵکو تەنانەت

پێناسەکردنە ڕەسەنەکەی گرفتەکەش گۆڕدرا، واتە زەبری پیاوان دژ بە ئافرەتان، دووبارە شێوەی درایەوە. ئەوی گرووپە فێمێنیستیەکان ناویان نابوو "زەبروزەنگی ئافرەتان" گۆڕدرا بۆ تێرمی "زەبروزەنگی خێزان". بەو شێوەیە ئەو ڕاستییە شێوێندرا کە قوربانییەکە لە ڕاستییدا سەر بە جنسێکە و تاوانبارەکەش سەر بە جنسێکی دیکەیە. بەو شێوەیە ئەو هەڕەشە خۆماتدەرە سیاسیەی کە فێمێنیستەکان لە پشت چالاکی خۆیانەوە هەیان بوو ـ کە ئافرەتان وەک گرووپێک داوای دەستەلاتیان دەکرد ـ پووچ کرایەوە.

سەرئەنجامگیریی ئەم لێکدانەوەیە ئەوەیە کە هەموو نارەزاییەکی سیاسیی کە هەڕەشە لە دەوڵەت دەکات لە مەترسیی لەپەلوپۆخستندایە. دەوڵەت لە توانایدا نییە ئافرەتان لە باڵادەستیی پیاوان ڕزگار بکات. ئافرەتان دەبێت خۆیان، لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا، لە بندەستیەکە خودئاگا بن (MacKinnon 1989b). لەبریتیی ئەوەی هەوڵ بدرێت لە ڕێگای کەناڵی سیاسیی جێگرتووەوە گۆڕانکاریی وەدەست بهێندرێت، دەبێت ئافرەتان بەجیا، لە دەرەوەی سیستەمەکەدا، خۆیان ڕێک بخەن. ئەو کاتەی کە ئافرەتان لە ناو ڕێکخراوگەلی خۆیاندا ئافرەتانی دیکە دەبینن، بە هەلومەرجی خۆیان، دەتوانن ئەزموونی هاوبەشی بندەستیی و داوای هاوبەش بۆ گۆڕینی نیزامی دەستەلات، فۆرمولە بکەن.

## سنوورگەلی کەسێتیی و سیاسیی

فێمێنیزم لەگەڵ ئەو گیروگرفتە زۆرانبازی دەکات کە سیاسەتی کەسێتیی لە ڕاستییدا دەبێت چۆن بێت و دەوڵەت دەتوانێت و دەبێت چ ڕۆڵێکی لە خەباتی ڕزگارییدا هەبێت. ئاننا فیلیپس Anne Phillips پێی وایە کە ئەو فێمێنیستانەی لە خاڵی "دیاردە کەسێتیەکە دیاردەیەکی سیاسیشە" دەردەچن، دەکەونە ناو ناکۆکیەکەوە (پارادۆکسێکەوە) کاتێک کە پارێزگاریی لە مافی منداڵ لەباربردن دەکەن (Anne Phillips 1991). ئەوە بێگومانییەکە کە ئافرەتان ئەو مافە ڕەهایەیان هەیە کە بڕیار لەسەر لەشی خۆیان بدەن. ئەم دەلیلهێنانەوەیە لەوپەڕیدا دەڵێت شتێک هەیە کە ئافرەت دەبێت نەیخاتە ناو دەستی کەرتە دەوڵەتییەکە (گشتیەکە) ـ ـەوە. ئێمە هەرگیز نابێت بهێڵین کە دەوڵەت بڕیار لەسەر چارەنووسیی لەشمان بدات. نەشیاوە کە کەسێتیەکە و سیاسییەکە بخرێنە یەک تای تەرازووەوە. هەندێک بەشی ژیان دەبێت بە تایبەتێتی بمێنێتەوە و دەبێت سنوورێک لە نێوان کەسێتیی و سیاسییدا هەبێت. بەڵام ئایا ئەو سنوورە لە کوێدا ڕابکێشرێت؟

گەلێک کەس پێیان وایە کە بڕیاری ژنان لەمەڕ ویستن یان نەویستنی منداڵ پێویستە بڕیارێکی کەسیی و بێ بێنەوبەرە بێت. ئافرەتان دەبێت منداڵدروستکردن (زاووزێ) و سێکسیوالیتی لە دەستی خۆیاندا بهێڵنەوە. کەس نابێت بۆی هەبێت دەست بخاتە ناو ئەوەوە کە ئێمەی ئافرەت چ جۆرە سێکسکردنێکمان دەوێت (Phillips 1991). بەڵام بۆ ڕادیکالفێمێنیستەکان، کە سێکسیوالیتی وەک بناخەی بنچینەیی نیزامی دەستەڵات دەبینن، بێگومان ئەمە سنووڕڕاکێشانێکی ماقوڵ نییە.

کەواتە ڕیزێک تێگەیشتنی جودا هەیە سەبارەت بەوەی کە مرۆڤ چۆن لە تایبەتییەکە حاڵی ببێت. لەلایەکەوە مەسەلەکە ئەوەیە کە فێمێنستەکان مەبەستیان لە شتی جودایە کاتێك کە قسە لەسەر "ئەوی کەسیە سیاسیشە"، دەکەن. هەڵبەت پێویست ناکات ئەمە وا لێک بدرێتەوە کە هەر شتێک ئێمە لەگەڵ لەشی خۆماندا دەیکەین پێداویستانە لەلایەن گشتییەوە بەڕێوەببرێت و بڕیاری لەسەر بدرێت. بەڵکو زیاتر مەسەلەکە سەبارەت بە هەبوونی ئازادییە کە ئافرەت بتوانێت ئەزموونی کەسێتیی خۆی بگۆڕێت بۆ سیاسەت ئەگەر و کاتێک کە بخوازێت. دەربڕینەکە هەروەها بەو مەبەستەش نایەت کە ئیتر نابێت هەر هیچ سنوورێک لە نێوان ئەوەدا کە سیاسەتە و ئەوەی کە سیاسەت نییە هەبێت. ئەگەر هەر هەموو شتێک ببێت بە سیاسەت چەمکەکە واتای خۆی ون دەکات. ئەگەر سنوورەکانیش نەمێنن، ئەوا سیاسەتیش لە ئارادا نامێنێت.

ب. هۆنیگ دەڵێت (B. Honig 1992:225) "ئەگەر سیاسەت لە هەموو شوێنێک بێت کەواتە لە هیچ شوێنێکیش نییە". ئەوەش هەروەها شیاوە کە "کەسێتیەکە سیاسییشە" وەک ددانپیادانانێک لێکبدرێتەوە کە پێوەندییە دەستەڵاتیەکان لە کەشە کەسێتی و گشتییەکەدا بێمەجاز و پێوەبووانە پێکەوەگرێدراون. ئەوەش جۆرێک لە تێگەیشتنە بەو مانایە دێت کە هیچ ئاستێکی ژیانمان نییە مانای سیاسیی نەدات.

> جووتبوونی سێکسیی لە ڕەسەندا کارێکی کەسێتییە (تایبەتیە). لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی جووتبوونی سێکسی کۆدداره و شێوازی دەستەڵاتی نابەرابەر دەگرێتە خۆی و کاریگەریی خۆی دوورتریش لە سنوورە تایبەتیەکە داوێژێت [...] ئامانجی فێمێنیستگەلێک کە سەرنج دەخەنە سەر باڵادەستێتی ئەوەیە کە ڕوونی بکەنەوە چۆن دەستەڵاتی جۆراوجۆری کەسێتیی و گشتیی توند و نێزیک پێکەوە گرێدراون (Mansbridge 1993:364).

## تێبینی

١ گفتوگۆی سەبارەت بە ڕەووشتێکی ئافرەتیی تایبەت لە پێوەندی لەگەڵ دەرکردنی کتێبی "بە دەنگێکی دیکە" In a Different Voice (1982) و وەرگێڕانی سوێدیی (1985).ـی کارۆل گیلیگان (Carol Gilligan) دا بوو ، کارۆل مەبەستی ئەوەیە کە ئافرەتان شێوەیەکی تایبەتی تێگەیشتنی ڕەووشتییان هەیە کە لەسەر پێوەندی مرۆڤیانە و پەرستیاریی لەنگەر دەگرێت، نە بە پلەی یەکەم لەسەر پرنسیپیی ئەبستراکت وەک بۆ نموونە دادوەریی. کاریی ووارنێس (Kari Waerness 1984) لە خاڵی دەرچوونی لێکچووەوە گفتوگۆ لەسەر چەمکی ئەقلآنێتی پەرستیاریی rationality of caring دەکات. بەو چەمکە کاریی دەیەوێت جۆری ئەو ئەقلآنێتیە تایبەتیە بخاتە بەردەست کە ئەو پێی وایە، ڕەفتاری ئافرەتان کاتێک کە کاری پەرستیاریی جودا دەکەن، جڵەو دەکات.

٢ بۆ زیاتر پێداچوونەوەیەکی توێژینەوە فێمێنیستیەکەی سەبارەت بە دەوڵەتی خۆشگوزەرانیی بڕوانە بۆ نموونە داهلڕوپ (Dahlerup 1994)، ئێلمان (Elman 1996) و سەینسبێری (Sainsbury 1994)

٥

# دیموکراسیی و هاووڵاتێتیی

## دیموکراسیی پیاویانە

ئافرەتان هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ دیموکراسیی کەوتوونەتە پێوەندیەکی سەیرەوە. لە ئەسینای ئەنتیکدا، ئەو شوێنەی کە بە بێشکەی دیموکراسی دادەنرێت، ئافرەتان هەرگیز وەرنەگیران و قبووڵ نەکران. ڕۆڵی ئافرەتان لەو دیموکراسییەی ئەوێدا ئەوەبوو کە لە دەرەوەی بن. دیموکراسی، کە بە واتای فەرمانڕەوایی گەل دێت، بەو واتایە بوو کە تەنیا پیاوانی گەورەساڵ و ئازاد دەستەڵاتدار بوون. کۆیلە و ئافرەتان بە هیچ شێوەیەک بۆیان نەبوو هاووڵاتیی بن. ئەوان هەر وا سووک و هاسان وەک خەڵک نەدەبینران.

لە دۆخێکی ناسکی دیکە لە مێژووی دیموکراسییدا، لە شۆڕشی فەڕەنسادا، ئافرەتان خۆیان لەو دۆخە سەیرەدا دەدیتەوە کە داوای مافەکانی پیاوانیان دەکرد، ”less droits de l´ homme“، ئەو مافانەی کە پاشان دەرکەوت کە ئارەزووکردنیان بۆ ژیان ترسناکە. کاتێک کە ئولیومپە دی کۆگێ Olympe de Couges پێی داگرت کە ئافرەتان بەو مافە "شاد" بوون کە بچنە سەر سەکۆی مەرگ، هەرواش دەبێت مافی خۆیان بێت بۆیان هەبێت بچنە سەر مێزی ئاخافتن، سەری پەڕێندرا (Scott 1996). بە هەرحاڵ، ئەو دەستتێوەردانەی ئەو لە کەرتی گشتی زۆری لەسەر کەوت. بە گشتیی سەدان ساڵە گۆتوبێژی لەمەڕ دیموکراسیی دەستی پێکراوە، بێ ئەوەی ئافرەتان بەشداری تێدا بکەن (Phillips 1991).

ئەمەش بێگومان لە دۆخی ڕاستەقینەی سیاسەتدا ڕەنگ دەداتەوە. هەتا ناو قوڵایی سەدەی بیستهەمی خایاند تا ئافرەتان لەو بەشەی جیهانی ئێمەدا مافیان چنگکەوت دەنگ بدەن.١

بەو پاشەڵە (ڕابردووە) سێکسیستیەوە کە سیستەمی دیموکراسیی هەیەتی، هەتاوەکو ئەمڕۆش هەم لەلای پیاوانەوە شێوەی دراوەتێ و هەم لای ئەوانیشەوە بەڕێوە بردراوە، ئەمە زۆر سەیر نییە. یاسادانان و یاسا پێڕەوکردن لە دەمێکی درێژدا، لەو ڕێگایەوە کە ئافرەتان لە هاووڵاتێتیەکی تەواومانا دەر دەهاوێژران، هەر لە بەرژەوەندی پیاواندا بوو. ئەمڕۆ یاساکان بەشێوەیەکی دیکە شێوەدار کراون. لە خودی شێوەکەیدا جنس، بۆ ئەوەی گەرانتی هاومامەڵەیی کردن بە هەمووان بدات، بێلایەنە. بەڵام کە ئەمە یارمەتی ئافرەتانی نەداوە بگەنە بەرابەریی و هێشتا باڵادەستیی پیاوان لە ئۆرگانە بڕیاردەرەکاندا، لە ناو مووچەخۆرانی دەوڵەتی و دادگاکاندا، هەیە، دەر دەکەوێت. سەرەڕای ئەوەش ئەگەرچی یاسا و ڕێسا دەوڵەتییەکان ئیتر بەڕەسمیی ئافرەتان هەڵناوێردێ، هێشتا هەر کۆمەڵگا

بەرابەر نییە. ئافرەتان لە هێلانە و مەمەڕەكانی دەستەڵاتدا بە توندی كەم نوێنەرن. ژیانە ڕەسمییەكە و گۆتوبێژە تیئۆریەسیاسیەكان سەبارەت بە دەستەڵات، نەیانتوانیوە لەم ڕەنگدانەوەیە دەرباز بن.

لە تیئۆری سیاسیی نەریتییدا ئەوە بە گیروگرفت و ئاستەنگ نابینرێت كە سیستەمی دیموكراسیی ئاساییانە ئافرەتان دەردەهاوێژێت، و بەزۆرییش ئەمڕۆكەش هەر وایە. نووسەری ئەو كتێبی خوێندنە كە تازە دەرچووە و كە لەسەر دەستووری سوێدییە، دەپرسێت: "لەبەرچی پیاوان ناتوانن تەنانەت لەبەردەوامیشدا هەر نوێنەرایەتی ئافرەتان بكەن وەك كە سەدان ساڵ كردویانە؟" (Larsson 1994:115). پاش چەند پەڕەیەك دەلیلهێنانەوە لەسەر ئەم پرسە بەچێژە، نووسەرەكە خۆی دەگاتە ئەم سەرئەنجامە:

> دەی، وەڵامی ئەو پرسیارە چیە كە ئەگەر بوونی چەند ئافرەتێك لە دامەزراوە بڕیاردەرەكانماندا پێویست بن یان نا؟ بەو پێناساندن و ئامادەكارییەشەوە وەڵامەكە هەر نەخێرە. سیستەمە سیاسیە نوێنەرایەتیەكەی سوێد لەسەر بناخەی *نوێنەرایەتی ڕاوبۆچوون* دامەزراوە، نەك لەسەر نوێنەرایەتی كۆمەڵایەتی. بۆ پێڕەوكردنی نوێنەرایەتی كۆمەڵایەتیش مرۆڤ پێویستە، نەك جنسەكەی.٢ (Larsson1994:117)

ناوەڕۆكی تیئۆری دیموكراسی فێمێنیستیی ئەوەیە كە سیستەمێك بە دیموكراسیی دانانێت كە لەسەر بناخەی دەرهاویشتن و بندەستهێشتنەوەی سیستەماتیكانەی ئافرەتان شكڵی پێ بدرێت و شكڵ وەربگرێت. سیستەمە دیموكراسیەكانی ئێستا لەسەر نیشاندانی ئەو ناكۆكیە بناخەیان داكوتاوە كە هەندێك كەس لەبەر جنسەكەیان، كتومت زیاتر دەستەڵاتدارن:

> ئێمە ئێستەكانێ دەبێت "ناكۆكی دیموكراسیی" چارە بكەین كە بەهۆیەوە دەستەڵاتی كۆمەڵایەتی پلەی هەندێك هاووڵاتیی زیاتر دەكات وەك لە هاووڵاتیی دیكە، و یەكسانێتی هاووڵاتێتیش هەندێك هاووڵاتیی دەكات بە هاووڵاتیی بەهێزتر (Young 1989:259).

فێمێنیستەكان لەسەر ئەوە كۆكن كە دیموكراسیی دەبێت بیراز بكرێت، بەڵام لە ناو خۆیاندا تێگەیشتنی جودایان هەیە كە چ جۆرە گۆڕانكارییەكی كاریگەر بۆ كردنی ئەو كارە پێویستن. كەمێك گەورەكردراو دەتوانرێت بگوترێت كە گفتوگۆكە سەبارەت ئەوەیە كە چۆن دەتوانرێت گۆڕان لە ناو سیستەمە ئێستاییەكەدا بكرێت، یان ڕەنگە خودی سیستەمەكە بێمەجاز بە نیزامی دەستەڵاتی جنسیەوە ئاڵۆزكاو بێت.

هەندێک پێیان وایە کە دیموکراسیی لیبراڵیی لە ڕزگارکردن دێت، بەو مەرجەی کە بندەستتێتی ئافرەتان چارە بکرێت. فێمێنیستانی دیکە مەبەستیان ئەوەیە کە نیزامی جنسیی لە ناو خودی سیستەمە دیموکراسیەکەدا، لە ناو هاوولاتیبوونەکە و لە تیئۆریە سیاسیەکەدا هەیە. تەنانەت ئەگەرچی هەندێک تیئۆریگەل و پراکتیکگەلیش بە ئاشکرا ئافرەتان هەڵنەوێردن، هێشتا ئەوانە هەر بە قاڵبی پیاوان فۆرمێندراون.

## جنس و دیموکراسیی

سەرنجی ڕەخنەی فێمێنیستیی لەسەر ئەوەیە کە چۆن تیئۆریگەلی دیموکراسیی لە "یەک مرۆڤ ـ یەک دەنگ"ـەوە سەرچاوەی گرتووە و بەو شێوەیە پێ دادەگرێت کە ئەو شێوە جنسەی هاوولاتی هەیەتی ناوەڕۆکێکی سیاسی نابەخشێت و بێبایەخە. ئەم هاوولاتێتیە بێجنسە کە دروستکراوە، پێشمەرجە ڕاستەقینەکانی دیموکراسیی دەشارێتەوە ـ کە لە ڕاستیدا سەربەجنسبوون، کاتێک کە دێتە سەر ئەوەی کێ دەستەلات و نفوز هەیە، تەواو گرینگە و خاڵێکی ناوەندییە. لە سیاسەتی پیادەکراودا بەرژەوەندی گشتیی هەم لەلایەن ئەو گرووپەوە و هەم لە پێناوی ئەو گرووپە خۆیدا، کە خۆی مافی بە خۆی داوە نوێنەرایەتی هەمووان بکات، دەخەملێنرێت. ویستەی گشتیی لەلایەن پیاوانی سپیپێستی تەمەن مامناوەندەوە شێوە و ناوەڕۆکی دەدرێتێ. مۆد ئێدواردس (Maud Edwards 1993) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم ڕاستەقینەیە، دژی وێناکردنە داسەپاو و ڕەگ داکووتاوەکانە کە گوایە جنس نە مانای سیاسیی هەیە و نە دەبێت هەیشی بێت.

> نۆرمی پیاوانە ئەوەیە کە پیاوان، وەک پیاو ـ هەبوونیان نییە. ئەوان وەک پۆلێکی جنس پناسە ناکرێن. ئەفسانە گشتییەکە ئەوەیە کە فەرمانڕەوایان و دەستەلاتدارن متمانەیان پێ دراوە چونکە ئاقڵمەندن و ڕەچاوی بەرژەوەندیی گشتیی دەکەن، نەک لەبەر ئەوەی کە پیاون. (Eduards 1993:104)

تیئۆری دیموکراسیی فێمێنیستیی هەنووکەیی لەسەر "دیموکراسیی هاوئاستیی Parity democracy" (هاوئاست = Parity) قسان دەکات. ئەوەش وەک هەوڵدانێک بۆ چارەکردنی ئەو گیروگرفتانەی کە لە هاوولاتێتیەکی لایەنگری جنسدا هەن. ئەو بیرەی لە پشت "دیموکراسیی هاوئاستیی Parity democracy" ـەوەیە ئەوەیە کە دابەشبوونی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بۆ دوو جنس، ئافرەت و پیاو، دەبێت لە

دامەزراوە ڕەسمییەکاندا ڕەنگ بداتەوە. دۆخی نابەرابەرێتی نێوان جنسەکان دەبێت، لەبری ئەوەی کە تەنیا وەک دۆخێک کە بە جێی داخ دابنرێت و وەک وردە زیخێکی ناو مەکینە دیموکراسییەکە ببینرێت کە دەنا وەکتر زۆر باش چەورکراوە و کە گوایە بێ لەو گرفتە خەوشێکی دیکەی نییە، دەبێت لە فۆرماندنی سیاسەتدا خاڵی *سەرەکی و دەستپێک* بێت.

> جۆری مرۆڤایەتی یەک دانەیە، بەڵام هاوبەرگ نییە. مرۆڤایەتی ناتوانێت بە دروستییەوە هەبێت یاخود زەنگینی تەواوی خۆی بنوێنێت هەتا پیاوان و ئافرەتان وەک خۆیان شوێنی خۆیان چنگ نەکەوێت و هەتا دامەزراوەکان باسێکی جیاوازیی نێوان جنسەکان نەگرنە خۆیان (Sledziewski 1992:24).

لێکدانەوەکان بەزۆریی ئەو ئەنجامگیریەیان هەیە کە ئافرەتان دەبێت نیوەی جێگاکانی ناو ئۆرگانە ڕەسمییە گرینگەکانی کۆمەڵگایان دەست بکەوێت. ڕەنگە یەکێک لە هەرە هۆیە گرینگەکان ئەوە بێت کە بەو شێوەیە بتوانرێت بیرۆچکەی دەستەڵات بگۆڕدرێت. کاتێك ئافرەتان لەو شوێنانەدا نیین کە دەستەڵاتیان لێیە ئەو وێنەیە بەهێز دەکات کە ئافرەتان نرخ و توانا و لیاقەتیان لە پیاوان کەمترە.

> دەرهاویشتنی سێکسیی لە خانەی سیاسەتدا وێنەیەکی ئافرەت دەخەملێنێت کە لە پیاو کەمتواناتر، کەملایەقتر و ناتەواوترە. (Hawkesworth 1990:185).

دیاردە کەسێتییەکە بێگومان سیاسییە ـ بەڵام کرۆکی ئەم دەلیلهێنانەوەیە ئەوەیە کە دیاردە سیاسیەکەش هەروەها دەتوانێت ببێت بە کەسیی (تایبەتی). ئیدیئالی (نموونەباڵای) سیاسیی وێناکردنی کەسیی دروست دەکات. ئەگەر ئافرەتان دەستەڵات و فەرماندەیی authority ـ یان بدرێتێ ئەوا ئارەزوومەندیی سیاسیی و پرسەکانیان بۆ یەکەم جار بە گرینگ دەبیسترێن. جێبەجێکردنی بنیاتنانەوەی ڕادیاکالآنەی ئەم دەستەڵاتە گشتییە هەر بە تەنیا نرخی سیمبولیکی نابێت. هەروەها ئەو مانایەش دەدات کە ئافرەتان خۆیان دڵنییا دەکەن لە بەرانبەر ئەو هەنگاوە سیاسییانەدا کە دەشێت زیانیان پێ بگەیەنێت یاخود دەتوانێت جێپێیان (پلەوپایەیان) بەرەو دواوە بباتەوە.

ئەگەر ئافرەتان لەسەداپەنجای جێگاکانی ناو ئۆرگانە ڕەسمیەکان (دەوڵەتیەکان) وەربگرن، ئەوا ئەمە دەتوانێت وەک چەشنێک بێت لە خۆپارێزیی بۆ ئافرەتان (Hawkesworth 1990). ستراتیژیەکی لەو شێوەیە ئەوەیە کە ئافرەتان، کاتێک باس لەسەر هەندێک پرس بێت کە بەتایبەتی پێوەندی بەوانەوەیە، جێی خۆیەتی لە ڕێکخراوە سیاسییەکاندا مافی ڤیتۆیان هەبێت.

کۆمەڵە پرسێک هەن کە تایبەتن بە ئافرەتانەوە. شتێکی ناماقوڵە کە پیاوان بڕیار لەسەر پرسیارگەلێک بدەن کە گرێدراوی ئافرەتانن، وەکو پرسی لەباربردن، زەوتکردنی سێکسی یان لێدانوکوتانی ئافرەتان (Young 1991) .

ڕەخنەی دژ بە بنیاتنانی سیستەمی سیاسیی وا کە ڕەنگی دووجنسیی مرۆڤایەتی بداتەوە بەزۆریی سەرنج دەخاتە سەر ئەوەی کە بەو شێوەیە ڕێگا دەدرێت تەنیا قسە لەسەر تاکە یەک جیاوازیی بکرێت و ئەو جیاوازییە هەموو جیاوازیەکانی دیکە و نایەکسانێتیی دەستەڵات لە کۆمەڵگادا بخاتە پشت خۆیەوە. (Outshoorn 1994). ئەو بیرانە لەلایەن ئەم جۆرە ڕەخنەگرانەوە لەبەرئەوە سەرکۆنە دەکرێن، چونکە ڕەخنەگران پێیان وایە کە ئەم جۆرە بیرانە قووڵترین ناوەڕۆکی سیاسەت سەرەوبن دەکەن. لێکدانەوەکەی ئەمان دەڵێت ئەگەر ئافرەتان لەبەرئەوە نوێنەرایەتیان دەکرێت کە ئافرەتن ئەوا سیاسەت واتای خۆی ون دەکات. مرۆڤێک ئیتر هەڵنابژێردرێت لەبەرئەوەی دەتوانێت هەڵبژێرەر ڕازی بکات، بەڵکو لەبەرئەوە هەڵدەبژێردرێت چونکە "ئەو" سەر بەم یان ئەو جنسەی دیکەیە.

> کە داوا بکرێت ئافرەتان هەمیشە لە ناو حوکمەتکردندا بەشدار بن، ئەوە دەگەیەنێت کە هەر هەموو واتای سیاسەت ون بووە. (Voet 1992:394)

ناڕەزاییەکی دیکە ئەوەیە کە ناکرێت بگوترێت ئافرەتان بەرژەوەندی تایبەتیی هاوبەشییان هەیە کە ڕاستەوخۆ دەتوانن لە سیاسەتدا بیپارێزن. بۆچی سیاسەت، هەر تەنیا لەبەر ئەوەی نیوەی سیاسەتمەداران ئافرەت بن، جیاواز دەبێت؟ (Outshoorn 1994) ئافرەتان هەر تەنیا ئافرەت نیین. ئەوان هەروەها دەتوانن وەک هەر مرۆڤێکیی دیکە بەرهەڵستکاری هێزی ئەتۆمیی بن، ڕەشپێست بن، کاتۆلیک یان مرۆڤێکی خاوەن سەگ بن. ئەوانەی دژی یەکسانیی نوێنەرایەتی سیاسی ئافرەتانن بەو شێوەیە گەرەکیانە ئەو ڕاستییە بگەیەنن کە ئافرەتان ناسنامە و وەفاداریی دیکەشیان هەیە، بۆ ئەوەی هەر بە تەنیا لەبەر ئافرەتبوونیان نوێنەرایەتیان نەکرێت.

شێوەیەکی دیکە بۆ مامەڵەکردنی پرسەکە ئەوەیە کە دەبێت جیاوازیی لە نێوان شێوەی سیاسەت و ناوەڕۆکدا بکرێت (J nasd ttir 1998). ئەسڵەن نەشیاوە بزانرێت ناوەڕۆکی سیاسەت چۆن دەگۆڕێت ئەگەر ژمارەیەکی زیاتر لە ئافرەت بەشداری تێدا بکەن. تەنانەت ئەگەر ئافرەتان خاوەنی چەند بەرژەوەندیەکی بابەتی (ئۆبجێکتیڤیی) ئافرەتیانەش نەبن، ئەوا هەر یەک دانە بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە کەشە گشتییەکەدا بەشداربن و لە بڕیاردا بن، واتە لە پرۆسە سیاسیەکەدا بەشدار بن.[٣]

ئاماژەش دەکرێت کە کە گۆتوبێژی لەمەڕ بەرژەوەندی جودای ئافرەتان هەر نەدەبووایە بکردرایە. بۆ بەشداربوون لە سیاسەتدا ئافرەتان بە هیچ شێوەیەک نەدەبا هەرگیز پێویستیان بەوە بێت بیسەلمێنن کە شتێکی زێدەتر دەخەنە سەر سیاسەت وەک لەوەی پیاوان دەیکەن (Jansson 1994). ئافرەتان هەر چییەک بکەن یان بە تەمابن بیکەن، مافی خۆیانە کە بەشدار بن. لە دیموکراسیەکی دروستدا، لە دیموکراسیی ئاییندەدا، ئافرەتان دەبێت تیایدا و لەگەڵدا بن:

> دیموکراسیی بێ ئافرەتان چی دی وەک دیموکراسیەکی ناتەواو نابینرێت، بەڵکو تەواو وەک نادیموکراسیی دەبینرێت. (Slediziewkski 1992:27)

## جنس و هاووڵاتێتی

چەمکی هاووڵاتیی لە گۆتوبێژی تیئۆری دیموکراسییدا ناوەندە. بۆ ئەوەی دووبارە باسەکە بە بەشی پێشووەوە ببەستینەوە، دەتوانین بڵێین هاوکات کە گۆتوبێژەکە لەسەر "ئەوەی کەسییە سیاسییشە" سەرنجی دابووە کەشە نێزیکیەکە (ئینتیم) و پێداویستیی بەسیاسەتکردنی ئەو کەشە، فێمێنیستانی گۆتوبێژی هاووڵاتنێتی هێرش دەبەنە سەر پرسە سیاسییە کلاسیەکیەکان کە لەسەر نوێنەرایەتی سیاسی و کارتێکردنی سیاسیی دەدوێن. باسەکە لێرەدا دووبارە سەبارەت بە مافداریی و ئەرکداریی سیاسیی هاووڵاتییان و سەبارەت بە هەلداریانە لە بەشداربوون و لە کارتێکردن لە سیاسەتدا (Siim 1994) .

جارێ پێش هەر شتێک مەحاڵە بزانرێت کە "هاووڵاتیی" کێیە، بێ ئەوەی لەو پێکهات و ناوەڕۆکە سیاسییە بڕوانین کە ئەو هاووڵاتییەی تێدایە. کۆمەڵگایەک کە ئافرەتان بەتایبەتی تیایدا خاوەنی دەستەڵاتێکی کەمترن وەک لە پیاوان، بێگومان ئەو هاووڵاتێتیەی تێدا فەراهەم دەبێت کە شایستەیەتی ـ ئەویش هاووڵاتێتیەکە کە لەسەر پرنسیپی هەڵاواردن بنیات نراوە. تەنانەت ئەگەرچی ئافرەتان هەنووکە بەڕەسمیی وەک پیاوان خاوەنی هەمان مافگەلی هاووڵاتیین، بەو واتایە نایەت کە لە پراکتیکدا بەرابەرن. ئایا بەڕاستیی ماقووڵە ئافرەتان وەک هاووڵاتی ئازاد و سەربەخۆ لە قەڵەم بدرێن کاتێک کە ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین نە سەربەخۆیی ئابووریان وەچنگ دەخات و نە سەروەریی فیزیکیان گەرانتی دەکات؟ ئایا ماقووڵە تیئۆریی نەریتیی (ترادیسیونالی) دیموکراسیی چاو لەو هەلومەرجە جودایانە دەپۆشێت کە ئافرەتان و پیاوان هەیانە کاتێک کە ئەوان مافگەلی دیموکراسیی خۆیان پیادە دەکەن؟

> بوونیاتی ژیانی ڕۆژانە، بە هاوسەرداریێتیشەوە، بە باوەڕ و کردارگەلێکەوە دامەزرێندراوە کە وادادەنێت ئافرەتان سرووشتیانە بندەستەی پیاوانن - هاوکات کە نووسەرانی دیموکراسیی بەردەوام پێیان وایە کە ئافرەتان و پیاوان دەتوانن و هەرواش ئازادانە لە هەلومەرجدا بەرابەر، پێکەوە وەک هاووڵاتیی دیموکراسیی سەرفراز، هەڵدەسوڕێن. (Pateman 1989:220)

ڕەخنەکە لەو پنتەوە سەرچاوە دەگرێت کە هاووڵاتێتی، سەرەڕای فۆرمی بێجنسی خۆی، لە بناخەدا جنسگرە. کاتێک لەسەر هاووڵاتیی قسان دەکرێت لە ڕاستییدا مەبەست لە هاووڵاتیی نێرە. لە بەشە تیئۆرییە ئابستراکتە گەردوونیەکاندا (فرە گشتییەکاندا) پیاو بە پێدزکێ خۆی وەژوور دەنێ:

> یەکێک لە هەرە فێڵە ئاساییەکان [...] بە دزی بردنی پیاوانی بەرجەستەیە بۆ ناو چەمکە نابەرجەستە و گەردوونیە گشتییەکان کە دەبێت بە خۆراکی بیرە سیاسیەکە. "تاکەکەس" یان "هاووڵاتیی" لێرەدا بەربژاری بێگومانن و پێویست ناکات هەڵبهێنرێت کە کێن. (Phillips1993:77)

لە ناو فێمێنیزمدا بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی کە چۆن چارەسەری ئەو گیروگرفتە بکرێت کە ئایدیالە هاووڵاتییە بێجنسە درۆزنەکە لەسەر ئافرەت دەی سەپێنێت. هەندێک بۆ ئەوە تێ دەکۆشن کە ڕووانینە ساختە هاولآتییەکە ببێت بە ڕووانینێکی "دروست" - کە سەربەجنس بوون لە ڕاستیدا هیچ ڕۆڵێکی لە ژیانی سیاسەتدا نەبێت. کۆڵەکەی بیری ئەم بیریارە یەکسانیخوازانە equality theorists (بڕوانە لاپەڕی ٤٥) ئەوەیە کە تاکەکەس و هاووڵاتیی وەک پۆل (کەتەگۆریی) بێ گرفتن و گیروگرفتێك دروست ناکەن، *بەو مەرجەی* کە ئافرەتان لە ڕاستەقینەدا تێیدا بن. لە جیهانی ئاییندەدا نابێت جنس هیچ مانایەکی هەبێت، ڕەنگە هەر خۆیشی نەمێنێت.

بەڵام بیریارانی جیاوازیخواز ئەمە ڕەت دەکەنەوە و ئاماژە بەوە دەکەن کە مرۆڤایەتی بەڕاستیی لە دوو جنس، پیاو و ئافرەت، پێک دێت. وا باشترە مرۆڤ خۆی لەگەڵ ئەو ڕاستییە خەوشهەڵنەگرەدا ڕابهێنێت. هەموو هەوڵێک بۆ خستنە ناوی پیاوان و ئافرەتان بۆ ناو هەمان پۆل (کەتەگۆری) دەبێتە مایەی ڕیسکێکی پڕمەترسیی کە یەکێک لە جنسەکان (بە جێی بڕواوە جنسی پیاوان) دەبێت بە نۆرم .(Phillips 1993:79)

باوەجودی ئەوەی ناوی دەنێن "تاکەکەس" یان "هاووڵاتیی" ئەو بێئەملاولا پیاو - ـە، و واش پێ دەچێت کە هەر وا بمێنێتەوە.

## هاووڵاتێتی و دایکایەتیی

گۆتوبێژیی هاووڵاتیبوون هەروەها مامەڵە لەگەڵ ئەو پرسیارەش دەکات کە ئەگەر ناسنامەیەکی ئافرەتیی هەبێت کە بتوانێت ببێت بە خاڵێکی ڕامان بۆ جۆرێکی نوێ لە هاووڵاتێتی. ئایا شتێک لە دۆخی ئافرەتاندا هەیە کە زێدەنرخی پێ بدرێت و ببێت بە پارسەنگێک بۆ ئەو هاووڵاتێتییە پیاوانە قەڵخانداره کە ئێستا هەیە؟ یاخود هەموو ئەم جۆرە هەولآنە بۆ دۆزینەوەی ناسنامەیەکی ئافرەتیی هەر تەنیا کۆنەپەرستانە و سنووردارن؟

خاڵی پێ هەڵگرتنی کارۆل پەیتمان (1988 ،1989) Carole Pateman ئەوەیە کە ئافرەتان لە ناو دەوڵەتی مۆدێرندا هاووڵاتیی هاونرخ نین. ئەم ڕاستیە لە ناو ئەوەشدا دیارە کە چۆن ئەرکداریە هاووڵاتێکانی پیاوان و ئافرەتان جیاوازن. هەرە ئەرکی پیاوان، پاراستنی دەوڵەتە بە ژیانی خۆی، بەڵام بۆ ئافرەت دەبێت بە ئەرکداریەک بۆ دروستکردنی ژیان، بۆ خستنەوەی منداڵآن. بەڵام منداڵخستنەوە ئەرکێکی هاووڵاتێتیی نییە، بەڵکو وەک سیمبوڵی سرووشتیبوون و دەر لە سیاسەت دەبینرێت. لەبەر ئەوە منداڵخستنەوە هەر لە کەشی کەسێتییدا (تایبەتیدا) دەهێڵرێتەوە. کارۆل پەیتمان بەو شێوەیە مەبەستی ئەوەیە کە بەروئاوەژووی (دایکاتەمیی) تایبەتیی/گشتیی دەبێت تورِ بدرێت و زایینی ئافرەتان وەک کردارێکی سیاسیی ببینرێت. پەیتمان هەوڵی ئەوە نادات کە پۆلی پیاو و ئافرەت لە ژیانی سیاسییدا هەڵوەشێنێتەوە.

بەزۆریی دروست هەر دۆخە دایکایەتێتیەکەیە کە دەکەوێتە ژێر چەقی سەرنجی گۆتوبێژەهاووڵاتێتیە فێمێنیستیەکەوە. کارۆل پەیتمان لەسەر توانستی ئافرەتان دەدوێت کە دەتوانن ژیان دروست بکەن، نەک ئەوەی کە خودی منداڵبوونەکە خۆی دەبێتە مایەی جۆرێکی تایبەت لە ڕەووشتگەریی ئافرەتیی. بەڵام بیریارانی دیکە، بە پێچەوانەوە، وا دەبینن کە دایکایەتی دەتوانێت ببێت بە دانەری بناخەیەکی نۆرماتیف (پێوەرگەر) بۆ هاووڵاتێتی (بەراووردی لاپەڕەی ٤٩ بکە).

ئەم جۆرە فێمێنیستانە لەوێدا ناوەستن کە دوو جیهانی پیاوان و ئافرەتان هاونرخن و جێی خۆیەتی وەک هاونرخ ببینرێن، بەڵکو ڕۆشنایی دەخاتە سەر پایەبڵندیی ڕەووشتیی و توانستی ئاشتییهێنەری ئافرەتان (Dietz 1992) .

ڕەخنەی توند، لەم هەولآنە بۆ خۆشکردنی زەمینەیەک بۆ ئافرەتان کە لە سیاسەتدا بە هەلومەرجی خۆیانەوە بەشداربن، گیراوە. ڕەخنەگرەکان ئاماژە دەکەن کە ئەگەرچی ئەوە دەربازەڕێیەکی سەختە، هێشتا پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە گرووپێک لە یەکێکی دیکە بەنرخترە بەڕاستیی تایبەتیانە دیموکراسیی نییە. ئەو پێوەندیە نێزیکەی نێوان دایک و منداڵ ناتوانێت ببێت بە مۆدێل بۆ پێوەندی سیاسیی. لە پێوەندیی دایک ـ منداڵدا ڕەهەندێکی کەسێتیی هەیە کە لە سیاسەتدا

نییە. پێوەندی دایکوباوکایەتیی بێلەوە بە ڕوونیی هیرارشیە (هێڕەمییە) و لەبەرئەوە سەختە بهێندرێتە ناو گۆڕەپانی سیاسەتەوە کە جێی خۆیەتی پێوەندیەکان تیایدا خەسڵەتی یەکتربینینی نێوان هاوشانان هەڵبگرێت. لە سیاسەتدا هەم دەتوانین و هەم جێی خۆیشیەتی سنوورگەلی پێوەندییە کەسێتیەکانمان ببەزێنین. کاتێک کە ئێمە بەشداریی لە کەشی سیاسەتدا دەکەین ئەوا دەبین بە شتێکی دیکەی زیاتر لەوەی کە بە تەنیا نوێنەرایەتیی جیهانیی تەسکی خۆمان بکەین. لەبەر ئەوە دایکایەتیی هەرگیز ناتوانێت ببێت بە ئایدیالێکی سیاسیی.

> ڕاستییەکەی، هێزی دیموکراسیی لەو توانایەی دیموکراسی دایە کە تاکەکەس وەک مامۆستا، بازرگان، هەروەزکار، بەڕێوەبەر، منداڵ، خوشکوبرا، کرێکار، هونەرپیشە، هاوڕێ یان دایک بکات بە *جۆرێک لە بوونەوەری سیاسیی تایبەت*، بکات بە هاوولاتیەک لە ناو هاوولاتیاندا. (Dietz 1992:75 خەتەلارەکان هی ئێمەن).

بەڵام ئایا لە ڕاستییدا دەشێت کە مرۆڤ لە خۆی تێپەڕێت و ببێت بە بوونەوەرێکی دروستیی سیاسیی، ببێت بە "جۆرێک لە بوونەوەری سیاسیی تایبەت"[19]؟ ئایا ئێمە هەمیشە خۆیشمان ناخەینە ناو سیاسەتەوە؟ ئایا ئێمە هەمیشە وەک مرۆڤ ئافرەت، پیاو، دایک، کرێکار، تەسکبین و گەشبین یان جۆری تر نیین؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە، بیریارانی جیاوازیخوازی دەڵێن، چەمکێکی هاوولاتێتیە کە جیاوازیەکانیشمان دەگرێتەوە لە جیاتی ئەوەی دەریانهاوێژین. ئێمە دەبێت بۆمان هەبێت داوای سیاسیمان هەبێت لەبەر هەبوونی *جیاوازیەکانمان*، نەک سەرەڕای ئەوان. جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان دەبێت بۆ ڕەفتاری سیاسی خاڵی پێ هەڵگرتن بێت. کە ئێمە تەنیا وەک هاوولاتیی بتوانیین بگەینە ڕووانگەیەکی گشتیی و بێلایەنی سیاسی جگە لە ئەفسانەیەک چی دیکە نییە (Young 1989).

بیریارانی جیاوازیخواز و فێمێنیستە ئاراستە پلورالیستیەکانی دیکە جەخت لەسەر بایەخی گرووپە جیاوازەکان دەکەن و پێ دادەگرن کە جنس تەنیا تاکە بەندیواریەک نییە بۆ گرووپ بوون. بۆ ئەوەی هەمووان هەمان هەلومەرجیان دەست بکەوێت بۆ بەشداربوون، هەر ئەوە بەس نییە کە هەمووان هەمان یاساگەل پێڕەو بکەن. یاساگەلی تایبەت پێویستە بۆ ئەو گرووپانەی کە سیاستەماتیکانە هەڵدەئاورێن، وەکو ئافرەتان، بێگانان، کەمئەندامان یان بەساڵاچووان. جیاوازیی مرۆڤەکان پێویستە بئاخنرێتە ناو سیستەمە دیموکراسیەکەوە.

---

[19] "a special sort of political being"

> لەبری هاووڵاتێتیەکی گەردوونیی لە مانای بەگشتیبووندا، ئێمە پێویستمان بە هاووڵاتێتیەکی گرووپ جیاواز و جەماوەرێکی لێکنەچوو هەیە. لە جەماوەرێکی لێکنەچوودا، جیاوازیەکان لەلایەن گشتەوە سەلمێندراون و وەک پرنسیپێک کە قابیلی هەڵ وەشانەوە نییە ددانپێدانراون. (Young 1989:258)

فێمێنیستە پۆستمۆدێرنڕێبازەکان ڕێگایەکی دیکە دەگرنە بەر کە بە هیچ شێوەیەک بە فۆرمگەلە ناسنامەییە ئێستاییەکان ڕازی نابن (بڕوانە لاپەڕە ٤٩). ئەوان دەڵێن ئێمە وەک ئافرەت و پیاو، وەک ڕەشپێست و سپیپێست لە قەڵەم دەدرێین. ئەمە خۆی لە خۆیدا دەرئەنجامێکی دەستەڵاتبازێتییە. کاتێک مرۆڤ داوای هاووڵاتێتیەک دەکات کە لەسەر ئەم ناسنامە گیرخواردوانە دامەزرێندراون ئەوا بندەستەییەکە توندتر دەکات. واتە ئەو کەسە بەشداریی لە چەواسندنەوەی خۆیدا دەکات. کاتێک ئافرەتان داوا دەکەن کە وەک ئافرەت لە سیاسەتدا بەشدار بن بەو واتایە دێت کە ئەوان ئەو ناسنامە بەرسنووردارە پەسەندەکەن کە نیزامی دەستەڵات دای سەپاندووە. ئەم بیریارە فێمێنیستانە دەیانەوێت کە ناسنامە جنسیەکان هەڵبووەشێننەوە، نەك بهێڵنەوە. هاووڵاتێتیەکی ڕزگارکار ڕێگا بە مرۆڤەکان دەدات خاوەنی فرەناسنامە بن، بەردەوام لە گۆڕاندا بن، و هەرگیز بەستراوە نەبن.

بەرپەچدانەوەیەکی ئەم تیئۆریانە ئەوەیە کە ئاڵۆز و پێچیدەن و کردنیان بە کردارێکی سیاسیی پراکتیک سەختە. تەنانەت ئەگەر ئێمە ئەو پەڕی پێشمان خۆش بێت کە جنس چیتر بایەخی لە ژیانی سیاسەتدا نەمێنێت و بڕواش بکەین ئەمە دەشێت بتوانێت لە ئاییندەیەکی دووردا ڕوو بدات، ئەوا ئەم پرسیارانە هەر دێنە گۆڕێ: ئێمە تا ئەو دەم چی بکەین؟ و چۆن مرۆڤ ناسنامەی خۆی هەڵبووەشێنێتەوە؟

## تێبینی

۱. ساڵی ۱۹۲۱ ئافرەتان لە سوێد مافی دەنگدانیان وەرگرت، لە سویسرا ساڵی ۱۹۷۱.

۲. تێگەیشتنە گشتییەکە ئەوەیە کە سیستەمی سیاسیی سوێد تەنیا لەسەر نوێنەرایەتیی ڕا (بۆچوون) دامەزراوە. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە نوێنەرایەتیی جوگرافیی لە سیستەمی ڕەسمیماندا بناخەییە. کاتێک کە چاوەڕوانی لە کەسێکی خەڵکی ناوچەی سکۆنە ناکرێت نوێنەرایەتیی کەسێکی نۆرلاندی بکات، چاوەڕوانیی لە پیاوێک دەکرێت ـ بەو دەلیلەی کە پیاوان هەمیشە کردوویانە ـ کە بتوانێت نوێنەرایەتی ئافرەتێک بکات.

۳. هێلگا هێرنێس Helga Hernes (1982) لێکدانەوەی خۆی سەبارەت بە زێدەکردنی نوێنەرایەتی ئافرەتان لە دەوری سێ جۆرە بیرۆکە arguments بنیات دەنێت. بە پێی بیرۆکەی دادوەریی justice ئەوا بەشداریی ئافرەتان تەواو پرسێکی دادوەرییە. لەبەرئەوەی ئافرەتان نیوەی کۆمەڵن ئەوا دەبێت نیوەی دەستەڵاتیان هەبێت. بیرۆکەی سەرچاوە resources ئاماژە دەکات کە ئافرەتان خاوەنی ئەزموون و زانیاریی دیکەن وەک لە پیاوان. کۆمەڵگا دەتوانێت سوود لە بەکارهێنانی توانستی ئافرەتان وەربگرێت. دوا دانە، بیرۆکەی بەرژەوەندیی interests لەو خاڵەوە پێ هەڵدەگرێت کە ئافرەتان بەرژەوەندیی تایبەتیان هەیە کە لەگەڵ بەرژەوەندی پیاوان دەکەوێتە ناکۆکییەوە. ئافرەتان پێویستە بەشداریی لە سیاسەتدا بکەن بۆ ئەوەی پرسگەلی لەمەڕ خۆیان بەرنە پێش و ئاگایان لە بەرژەوەندیی خۆیان بێت، چونکە پیاوان ئەو کارەیان بۆ ناکەن.

# ٦

# زانیاریی و لەش

## زانست و پیاوێتیی

> نوێنەرایەتیكردنی جیهان، هەروەک جیهان خۆی، كاری پیاوانە؛ ئەوان لە ڕووانگەی خۆیانەوە وەسفی دەكەن، كە بە بڕوای خۆیان ڕاستیەكی ڕەهایە.
> (de Beauvoir 1949; 1970:13)

بە پێی نەریتی زانستبینی نابێت كەسی لێكۆڵەر كار بكاتە سەر كارە زانستییەكەی خۆی. كاتێک ئێمە دەچینە ناو جیهانی زانستەوە وا چاوەڕوانیمان لێ دەكرێت خۆمان بگۆڕین بە یەک پارچە هۆشمەندیی. ڕزگاربوو لە دەست لەش و جنسمان، لە پێداویستیی و لە داخوازیی كەسییمان، چاوەڕوانیمان لێ دەكرێت زانیاریەكی گشتگری گەردوونیانە و ڕاستیی بابەتیی (ئۆبجێكتیڤیی) وەبەرهەم بهێنین.

بێگومان مەحاڵە ڕاستیەكی بابەتیی وەدەست بهێندرێت. جیهانی زانستیی سەرەڕای هەموو شتێک هێشتا هەر جیهانێكی دیكە نییە، خاكێک نییە لە شوێنێكی دیكە بێت. لە جیهانی زانستیشدا لەش و جنس، هەست و ئەزموونمان هەر حازرە:

> لێرە كوتاڵ و بۆن و بەرام هەن. باڵندە بێبایەخەكان لەبەردەم پەنجەرەكەوە دەدەنە شەقەی باڵ. لێرە ئەم هەلآمەتی هەیە. لێرە دەژیێت. ئێرە ئەو شوێنەیە كە لێیشی دەمرێت. دەبێت وەک ڕووداوی مەتریاڵیی ڕاستەقینە بێتە ئەم شوێنەوە، جا وەک دەنگی وتارخوێندنەوە بێت، وەک خشەخشی سەر كاخەزێک بێت كە دۆكۆمێنتێكی پێک هێناوە، یاخود ڕاستەوڕاست هەر شتێک كە لە بارەی ژیانەوە دەیزانێت. هەرچۆنێک بێت دەبێت هەر لێرە ڕوو بدات، بۆ ئەوەی بتوانێت وەک ئەزموون بیبینێت. (Smith 1987b:82)

نیشاندانی ئەوەی كە جنس شتێک نییە لە دەستی ڕزگار بین یان بیگۆڕیین، لەگەڵ تێگەیشتنی بناخەییدا سەبارەت بەوەی كە زانیاریی چییە و زانست چۆن مامەڵەی لەتەكدا بكرێت پێكدا دەدەن. واتای لەش و جنس ون نابێت تەنیا لەبەر ئەوەی ئێمە دەست بە خوێندن یان توژینەوە دەكەین، بەڵكو ئەوان كاریش دەكەنە سەر ئەوەی لێی دەتوێژینەوە، و سەرئەوەی كە چۆن لە گیروگرفت دەڕوانین و چۆن گوزارە لە بوون دەكەین.

بەو شێوەیە تیئۆری فێمێنیستی هەر بە تەنیا بەرەنگارەوەبوویەک نییە دژ بە تیئۆریی دامەزراوی داسەپاو سەبارەت بە دەستەڵات و سیاسەت. تیئۆری فێمێنیستی هەروەها ڕەخنەیەکە لە چۆنیەتی فۆرماندنی ئەو تیئۆریانە و لەو گریمانانەی کە تیئۆری زانین لەسەریان وێستاوە. دروست هەروەک چۆن چەمکی هاوولاتیی و دیموکراسیی لە تیئۆری سیاسیی کلاسیکییدا بە ژێردەستەیی ئافرەتانەوە فۆرمێندراون، هەراواش بەرهەمهێنانی زانست ئاخنراوەتە ناو نیزامی دەستەلاتی جنیسەوە.

نۆرمی پیاوانە و ئافرەتانە هەم لە ناو ئەو تێگەیشتنەدا پڕە کە سەبارەت بەوەیە زانست چیە و هەم لەوەشدا کە چۆن بە باشترین شێوە زانیاریی پەیدا دەکرێت.

تێگەیشتنەبناخەییەکە لە ڕووانگە زانستییە نەریتیەکەدا ئەوەیە کە دەکرێت ڕاستەقینە (واقیع) بکرێت بە دوو بەشی تەواو لەیەک جوداوە، ئەوی دەزانێت و ئەوی کە دەکرێت بزاندرێت. "بزان (هۆش) و لێزانراو/قابیل بە زانین (سرووشت[20])".

سنووری نێوان ئەوەی کە خاوەن زانیارییە، کارایە و ئەوەی کە بەرکارە، واتە بابەتەکە، دەبێت وەک دەمی گوێزان تیژ بێت. مەرجی زانستی باش بابەتیبوونیەتی، ئەوەیە سنووری دیار و ڕوون لە نێوان لێتژێوەر و لێتوێژراوەدا.

ئەم بەروئاوەژوویییە ـ کە بابەتەکە هەمیشە بندەستەی "خودە"کەیە ـ لە ڕاستییدا بە توندیی ڕەنگی جنس دەداتەوە. ئەمە هەر بەلانی کەمەوە لەو مێتافۆرانەدا ڕوون دیار نییە کە لە هەردوو شێوەی پەسنی سرووشتی زانست و لە شێوەکاری زانستدا بەکاردەبرێت. بەڵکو هەروەها لە دەلیلهێنانەوەی زانیاری تیئۆریی کۆنیشدا مێتافۆرە جنسیەکان بە زۆریی ڕوون دیارن. نموونەیەک مۆدێلی زانیاریی فرانسێس باکۆن Francis Bacon ـ ـە. باکۆن قۆرخکردنی زانیاریی لە لایەن پیاوانی زانستکارەوە بە زەوتکردنی سێکسیوالێتی ئافرەتەوە لەلای پیاوەوە دەچوێنێت؛ پیاو خودە، ئافرەت بابەتە. ڕۆیال سۆسایتیی Royal Society، یەکێک لە یەکەمین و گرینگترین ئەکادیمییە زانستیەکان، ساڵی ١٦٦٧ لە نووسراوەی پرۆگرامەکەی خۆیدا هەر جۆرێکی وا لە تێڕوانینی زانستیی دەردەبرێت. هاوکات کە فرانسێس باکۆن سرووشت بە کۆیلەیەکی مێینە دەچووێنێت کە دەبێت ناچار بکرێت تەواو خۆی بەدەستەوە بدات، ڕۆیال سۆسایتیی زیاتر سرووشت وەک کچەدۆستێکی بێبار دەبینێت کە پێویستە تەواو جڵەو بکرێت:

---

[20] ”nature ("the knower (mind) and the knowable) Keller 1985:79”

> هەرکەس لەگەڵ سرووشتدا بکەوێتە چاوچاوێنێکی دروست و چارەنووسسازەوە، ناتوانێت تەقەلآی زۆر بدات یان هەڵبژێرێت: چونکە سرووشتیش (هەروەک لەسەر کچەدۆستانی دیکەش دەگوترێت) هەر دولبەرێکە، کە هەر زوو خۆی بۆ پیاوی سنگکوتەر و سەرسەخت شل دەکات. (Sprat 1667; 1958:124)

کاتێک کە دەستی هەوڵ و تەقەلا و کاری پیاوانی زانستکار دەگاتە ترۆپک و ئامانجی خۆی دەپێکێت، ئەوا چێژەکەی درەنگ ناکەوێت:

> سینەوبەرۆکی زێدەجوانی سرووشت دێتە بەردەم بیناییمان: دەچینە ناو باخ و گوڵزارییەوە، تامی میوەکانی دەکەین، و خۆشاوی پیت و فەڕییەکەی دەنۆشین. (Sprat 1667; 1958:327)

لە ناو ئەم چوارچێوەی تێگەیشتنەدا زانیاری بریتی دەبێت لە گرتنی دەستەڵات بەسەر، و زەوتکردنی، ئەوی ئافرەتییە. براین ئیاسلیا Brian Easlea وای دەردەبڕێت کە فەیلەسوفەکانی ١٧٠٠ ـ کان "تەقەلآی زانستیی وەک تێپەستانێکی ماسوولکەییانە دەبینن بۆ ناو سرووشتێکی مێینە" (1989:86).

ئەگەرچی مێتافۆرە جنسیەکان لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا شتێک هێزیان کەم بووەتەوە، هێشتا وێناکردنەکانی سەبارەت بە جنس هەر بە توندی بە ڕێساگەلێکەوە بەستراون کە چۆن زانستی دروست بخرێتە کار. کاتێک کە یەکەم بۆمبەئەتۆمیەکان دروست کران لێکۆڵەرەکان زۆر نیگەرانی هێزی تەقینەوەی بۆمبەکە بوون. کە ئەگەر بێت و بۆمبەکە تەقینەوەیەکی زەبرداری چاکی لێ بکەوێتەوە یاخود بە تەنیا بلآوبوونەوەی کەمێک تیشکی ڕادیۆئەکتیڤیی بداتەوە و بەس؟ پیاوانی زانست خۆیان لە ناو خۆیاندا ئەو کارەیان وەک ئەوە دەردەبڕی کە هەوڵی لەدایکبوونی کوڕێکیان دەدا، واتە "سەرکەوتنێک" و کچێک نا، "کوێرەبۆمبێک" (Easlea 1983:95). ئامانجەکە دیاری کرا بوو: "زرمەیەکی پیاوانە نەک جووکەیەکی مێیانە" (Nuke Collection 1993:43). مێتافۆرە جنسیەکان هەروەها ئەو کاتانەش کە لە ئاخافتنی ڕۆژانەدا پەسنی زانست دەکەین، دەردەکەون:

> کاتێک کە زانستە بابەتیەکان بە "ڕەق" ناودەنێین وەک پێچەوانەیەک بۆ لکی زانیاریی نەرمتر (واتە شتێکی زۆر خودیی)، ئێمە کتومت پەنا بۆ مێتافۆرێکی سێکسی دەبەین، کە تیایدا بێگومان "ڕەق" نێرینەیە و "نەرم" مێینە. تەواو بە گشتیی، فاکتەکان "ڕەق" ـن و هەستەکانیش "نەرم" ـ ن، [...] ئافرەتێک کە زانستیانە یان بابەتیانە بیر دەکاتەوە ئەوا "وەک پیاوێک" بیر دەکاتەوە: پیاوێکیش کە لێکدانەوەکەی نائاوەزمەندانە و نازانستییە ئەوا "وەک ئافرەتێک" شت لێک دەداتەوە. (Keller 1985:77)

تەواو هەر وەک فێمێنیستەکان مەبەستیانە کە سیاسەت و پیاوەتیی پێکەوەگرێدراون (بڕوانە لاپەڕە ٢٣) هەروەها زانست و پیاوەتیی یەکتر تەواو دەکەن. سەرەڕای ئەوە کە زانست ئاوا بە ئاشکرا یەکجنسییە، کەچی وەک هەمەلایی، بابەتیی، ئاوەزیی و ئەقڵیی لە قەڵەم دەدرێت. بۆ ئەوەی زانست بتوانێت زانست بێت، دەبێت ئێمە بتوانین بە سەر ئەزموونی تاکەکەسیی، لەش و هەستدا زاڵ ببین.

ڕەخنەی فێمێنیستیی بە تەنیا هەر لەسەر شێوە هێرشە زانستیەکان نییە. بە درێژایی مێژوو زانست لە دەوری گیروگرفتی پیاوان خولاوەتەوە. لە ناو زانستی پزیشکییدا پیاو هەتا ئێستایش هەر نۆرمە، کە بێگومان سەرئەنجامی کوشندەی بۆ ئافرەتان هەیە. ئافرەتان زۆر جاران فەحسی چەوت و تیمارسازیی خراپتر لە پیاوان دەکرێن. نموونەیەکی ئاشکرا ئەوەیە کە دامەزراوە دەرمانەوانییەکە تازە بە تازە لە ١٩٩١ دا "بۆی دەرکەوت" کە نێزیکەی هەموو خوێندنەکان لەمەڕ نەخۆشیەکانی دڵ و ڕەگی خوێن لە پیاوەوە پێیان هەڵگرتووە. (Puranen 1994)

زانست ڕەنگی ئەزموونی پیاوانی داوەتەوە و تێگەیشتنەکانی پیاوانی سەبارەت بە جیهان گەیاندووەتە شوێنی خۆی. دیدی پیاوان لەسەر بوون بووە بە دیدی هەمووان. ئەو دیدە بووە بە نۆرم، بە بابەتیەبوون، تەنانەت بووە بە واقیعیش. پاتریزیا ڤیۆلی Patrizia Violi پێی وایە کە ئەزموونە کەسیەکانی پیاوان، لە ڕێگای کولتورە پاتریارکالیەکەوە (پیاوسالاریەکەوە) دەگەیەندرێتە شوێنی خۆی و دەچێتە ناو بیرە "بێلایەنەکەی" مرۆڤەوە Patrizia Violi (١٩٩٢). "مرۆڤ" وەک پۆل بەگشتیکردنێکە کە لە خودێتیە پیاوانەکەوە هێنراوە. ئافرەتان، وەک پیاوان، نوێنەرایەتیەکی هاوبەشیی هاونرخیان نییە. ئەوی ئافرەتان دەیکەن و بیردەکەنەوە ناخردرێتە سەر هاوبەشێتیە مرۆڤێکە. ئەزموونەکانی ئافرەت، کە بە پلەی یەک لە کەشە کەسێیەکەوە لکی دەرداوە، هەر وا بە کەسێتیی (تایبەتی) ماوەتەوە. زانیاریەکانی ئافرەتان لە نەوەیەکەوە بۆ ئەوەی تر ون دەبن. بەسەرهاتگەلی ئافرەتان خۆیان نابردرێنە پێشێ. ئەو بەسەرهاتانە خەفە دەکردرێن و لە بیر دەچنەوە.

> پێوەندیەکانی نێوان ئافرەتان هەرگیز لە کولتوریی پیاواندا هێمایان نەدراوەتێ، وەک ئەوەی کە پێوەندی نێوان پیاوان وەری گرتووە، و لەبەر ئەوە ئافرەتان ناتوانن بیکەن بە بەشێک لە هی خۆیان. ئەو پێوەندیانە (تەنانەت کاتێکیش کە هەبوون) ترازێدیانە بەستراونەتەوە بە کەشە کەسێتیەکەوە، بە لایەنە لە گۆنەهاتوو و بەگۆنەهێنراوەکانی ئەزموونی ئافرەتانەوە. (Violi 1992:173)

گێڕانەوە زانستیەکان، دروست هەر وەک چیرۆکەکانی دیکە کە پیاوان دەیانگێڕنەوە و کە بە درێژایی کاتەکان بۆ یەکتریان گێڕاوەتەوە، تەنیا پەسنی ڕاستەقینەی (واقیعی) پیاوان دەکات. ئەزموونەکانی ئافرەتان لەبەرئەوە کەسێتیی، تایبەتیی و لە ڕێ لادەر دەمێننەوە. ئەو ئەزموونانە ناتوانن هەمووان بگرنەوە و بەو شێوەیەش زانستیانە نەچوواو (بێبرەو) دەبن.

## ئەزموون و ڕزگاریی

تیئۆری زانستیی فێمێنیستی بە شێوەی جودا هەوڵ دەدات زانستێک وەدەست بهێنێت کە ڕاستەقینەی ئافرەتان بخاتە ڕوو و ئافرەتان بکات بە خودێکی زانست، نەک تەنیا هەر بە بابەتی خۆی. زانستێکی ئاوا دەبێت ڕەچەی ڕێساگەلە نەریتییە زانستییەکان بشکێنێت. هەروەها تیئۆری فێمێنیستیی هەوڵ دەدات بچێتە ئەو دیو تێگەیشتنە بەروئاوەژووکانەوە (دایکاتەمەکانەوە) کە لە زانستی نەریتییدا بناخەیین، وەک: بابەتیی/خودیی، ئاوەز/لەش، ئەقڵ/هەست، دووریی/نێزیکیی، گشتیی/کەسیی. خاڵی پێ هەڵگرتن ئەوەیە کە هەرەمە زانستیەکان دەبێت تێک بشکێندرێن و سەر لە نوێ دابمەزرێندرێنەوە بۆ ئەوەی زانیاری و ئەزموونی ئافرەتانیشیان تێ بئاخندرێت. هەندێک جار بەو شێوەیە دەردەبڕدرێت کە فێمینستان دەیانەوێت لە ئافرەت بکۆڵنەوە، نەک هەر بە تەنیا سەبارەت بە ئافرەت.

ئێڤا لوندگرێن پێی وایە کە هاوکات هەر ئەوە بەش ناکات کە بەروئاوەژووەکان هەڵبگێڕدرێنەوە. دانانی ئاوەز (ئەقڵ) لەبریتی هەست، دووریی بە نێزیکیی، هیچ چارەسەرێک نابەخشێت Eva Lundgren (١٩٩٣). لەو ڕێگایەوە کە نۆرمی جنسی پیاو ڕێی پێ دەدرێت نوێنەرایەتی چالاکی بیری بابەتیی (ئۆبجێکتیڤیی) بکات، هاوکات کە هی ئافرەتان دەبێت نوێنەرایەتی خودیی (سوبجێکتیڤیی) بکات، بوونیادی دەستەڵاتی پیاوان، لە جیاتی ئەوەی نەرمتر بکرێت، بەهێزتر دەکرێت. بەو جۆرە جیاوازی نێوان بابەت و خود تەواو دەبەستێندرێت و خودی بەروئاوەژووکردنەکانیش دادەسەپێندرێت. شێوەیەکی هێرشبردنی زانستیانەی ڕزگاریخواز دەبێت بۆ ئاوێتەکردنی ئەم دوو جیهانە لەگەڵ یەکتر کۆشش بکات، نەک ئەوەی کە جێی یەکێکیان بەوی دیکە بگرێتەوە.

لەم ئاراستەیەدایە کە ناوبراو بە بیریارانە هەڵوێستگرەکان Standpoint theorists کار دەکەن. ئەوان دابەشکردنی دووانیانە بەسەر زانیاری بابەتی و زانیاری خودیدا ڕەت دەکەنەوە. زانستێک بۆ ئافرەتان دەبێت ڕووانگەی خۆی لە ئەزموونی ڕۆژانەی

ئافرەتانەوە هەڵ بگرێت. تەنیا لە *ناوەوە* دەتواندرێت لە ڕیئالیتێتە کۆمەلایەتیەکە بگەیرێت. ئایدیالە بابەتییە نەریتییەکە ـ کە بە پێی ئەو لێکۆڵەر دەبێت خۆی وەدووربگرێت و لە دەرەوەی بابەتی توێژینەوەکەیدا بمێنێتەوە ـ تورِ دەدرێت. بەلام ئەمە بەو واتایە نایەت کە لێکۆڵەر "خودیی" دەبێت.:

> ئەوە بە واتای کارکردن دێت لەو ڕووانگەی زانینەوە کە لە پێش جوداکردنەوەی خودێتی و بابەتییەوەیە دێت. (Smith 1989:38)

ئەوەی کە دەبێت لێی بکۆڵرێتەوە ئەو گرفتە زانستییانە نیین کە پێشوەخت دیاریکراون، بەڵکو ئەزموونەکانی خەڵکانی تایبەتین. لێکۆڵەر وەکو بڵێن دەبێت هاوتەریبی بابەتە توێژراوەکە بووەستێت، پێوەندییەکە دەبێت بەرابەر بێت. ئەمە بەو مانایە دێت کە پلەی خودی لێکۆڵەوەر لە ڕیئالیتیە کۆمەلایەتیەکەدا، واتە "زانینی ناوەکیی" ئەو، بۆ کارە زانستییەکە دەبێت بە خودی خاڵی دەستپێک. لەو پێوەندییەدا، لەگەڵ ئەوانەدا کە لێکۆڵەر وتووێژیان لەگەڵ دەکات، وەریان دەگێرِێت و لێیان دەکۆڵێتەوە، زانیاری چ لەسەر ئەو مرۆڤانە و چ لەسەر خۆیشی، دەست دەکەوێت. لێکۆڵەر ڕیئالیتێتی خۆیشی و ئەوانی دیکەش ڕوون دەکاتەوە. ( Smith 1987a)

بیریارانی هەڵوێستگر پێیان وایە زانستێک کە لەسەر ئەم پرنسیپانە دابمەزرێت و ئەزموونگەلی ئافرەتان سەرچاوەی ڕامانی بێت، ئەوا هەروەها خەسڵەتێکی ڕزگاریخوازانەشی دەبێت. زانستی نەریتیی نرخی ئەزموونی مرۆڤەکان بە کەم دەگرێت. بێلەوەش دەبێتە مایەی دروستکردنی کۆمەڵە سیمبول و چەمکێک کە بونیات و بیری چەوسێنەوەر بە پێوە ڕادەگرێت. زانستی کۆمەڵگا لە شێوەدانەوەی ئەو ڕاستەقینەی (ڕیئالیتێتەی) مرۆڤەکان هەیانە و گۆڕینی بۆ "ئەو چەمکە هاوبەشەی کە هەیە و کە دەتوانرێت بەڕێوە ببرێت" دەوری خۆی دەبینێت (Smith1987a:86). خۆ ئەگەر زانست، بە پێچەوانەوە، بێت و لە ئەزموونی کۆنکرێتی مرۆڤەکانەوە سەرچاوە بگرێت و نەیەت خۆ بەدەست ئایدیالی بابەتەکەوە بدات، ئەوا دەتوانێت نیشانی بدات کە دەستەلات چۆن پیادە دەکرێت و پێوەندیەدەستەلاتیەکان چۆن دادەمەزرێن.

بیریارانی هەڵوێستگر مەبەستیان ئەوەیە کە پێوەندیەکانی دەسەلآت لە کۆمەڵگادا بە شێوەیەک ڕێکخراون کە ئافرەتان دەردەهاوێژن. ڕێک لەبەر ئەوەی کە ئافرەتان لە ڕاگرتنی پێوەندی دەستەلاتدا بەشدار نیین، ئەوا لە ڕووی مەعریفییەوە (Epitimological) ئیمتیازدارن. لە ئەزموونەکانی ئافرەتاندا نیزامی دەستەلات بە ڕوونیی دیارە ـ لەبەرئەوەی وەک بڵێین ئەوان لەدەرەوەی سیستەمەکەدان. ئافرەتان پێوەندییەکانی دەستەلاتیان دروست نەکردووە، بەڵکو تووشیان بووە. بۆیە

زانیاریگەلێک کە لە ڕووانگە و ئەزموونگەلی ئافرەتانەوە سەرچاوە وەردەگرن پەردە لەسەر میکانیزمە چەوسێنەرەوەکان هەڵ دەدەنەوە.

نووسینەوەی بیرەوەری ("Memory work") شێوەهەوڵێکی دیکەیە بۆ دەربازبوون لەو وەلاخستنەی ئەزموونی ڕۆژانە و کەسیی کە زانستی نەریتیی لە پشتەوەیەتی. فریگگا هاوگ Frigga Haug و هاوکارەکەی شێوازێکیان داهێناوە پێی دەگوترێت "شێوازی بیرەوەری". ئەو شێوازە لە بیرەوەریی تاکەکەس، لە هەندێک ئەزموونی تایبەتی ئەوانەوە، سەرچاوە دەگرێت.١ لە ڕێگای ئەو بیرەوەریانەوە دەگەینە تێگەیشتنێک کە چۆن مرۆڤ دەئاخنرێنە ناو نیزامی دەستەڵاتی کۆمەڵایەتییەوە. تێگەیشتن لەوەی چۆن مرۆڤ نیزامەکە وەردەگرێت و چۆن دەیکات بە هی "خۆی"، ئەوپەڕی مەرجی ڕزگارییە: "هەموو ئازادییەک بە ئازادیی خودەوە بەندە" ( Haug .(1987:35

نووسینەوەی بیرەوەریی پرۆسەیەکی هەرەوەزییە. میتۆدەکە بەو واتایە دێت کە بەشداران هەر یەکە و بیرەوەریەک لەسەر بابەتێکی دیاریکراو وەک لەش، خۆراک، ترس یان زانیاری یان هەر شتێکی دیکە دەنووسنەوە. پاشان بەشداران بە هەرەوەزیی خەریکی لێکدانەوەی ئەو بەسەرهاتەبیرەوەریە تاکانە دەبن. مەبەست لە نووسینەوەی بیرەوەریی بۆ ئەوەیە کە خۆ لە ڕووانگەیەکی دەرەکیی زانستیی نەریتیی ڕزگار بکرێت کە تیایدا پێوەندی دەرەکی و هۆکارەکان، بێ ڕەچاوکردنی ئەزموون، هەست و نەست، سەرنجیان دەخرێتە سەر. نیزامە کۆمەڵایەتیەکە لە ڕێگای بەسەرهاتە بیرەوەریەکانەوە دەخرێنە ژێرپرسیار و شی دەکرێنەوە و دەخرێنە تیئۆرییەوە. بەم شێوەیە ئیدی سنوورێک لە نێوان خود و بابەتی زانستدا نامێنێت.

یەکێک لە پرۆژەکانی نووسینەوەی بیرەوەریی کە گرووپەکەی فریگگا هاوگ جێبەجێی کرد سەبارەت بە لەشی ئافرەتە. بەسەرهاتە بیرەوەیەکان ڕەفتار لەگەڵ بیرەوەریی موو، لاق، بڵندیی، کێش و جلکوبەرگ دەکەن. ئەوان باس لە هەرە ڕووداوە ڕۆژانییەکان دەکەن: هەڵبژاردنی پۆشاک بۆ ئاهەنگێک، ڕۆیشتن بۆ لای ئارایشکار بۆ پرچبڕیین، بیستنی برایەک کە بە خوشکێکی خۆی دەڵێت مەمکەکانت وا گەورەبوون کە ئیتر لە ژێر بلووسەکەتەوە دیارن. سەرنجی بەسەرهاتەکان لەسەر ئەزموونە هەرە هەستونەستیەکانە و هەوڵ دەدەن نێزیک ببنەوە و تیشک بخەنە سەر ئەوەی کە لەو کات و ساتەدا کە شتەکە ڕووی داوە بەسەرهاتگێڕەوەکە چۆن هەستی کردووە و چۆن لە ڕووداوەکەدا ژیاوە.

لە ڕێگای لێکدانەوە و دووبارەلێکدانەوەی ئەم بەسەرهاتە لەشیانەوە دەگەینە تێگەیشتنێک کە چۆن ئافرەتان هەم بۆ لەشیان و هەم بۆ ئەو کارتێکردنەی کە لەشیان لەسەر مرۆڤی دیکەی دادەنێت بەرپرسیار دەکرێن. هەڵگرتنی بەرپرسیاریی بۆ لەشی خۆ بەو واتایە دێت کە لەش دەبێت بە شتێک، بە بابەتێک. ئافرەت لە

وێنەی ناو ڕۆژنامەکاندا "پێش" و "پاش" ئارایشێکی نوێ، ڕەنگی موو، چرچ لە دەموچاوگرتن یان دەستهێنانێک بە قوتووی سووراوسپیاودا، ئافرەتان دەخاتە ناو پێوەندیەکەوە لەگەڵ لەشی خۆیان وەک بابەت. لەشگەلێک کە هەرگیزاوهەرگیز بەس ناکەن، بەڵکو دەبێت بەردەوام بگۆڕدرێن و دەستیان پێدا بهێنرێت و چاک و باش بکرێنەوە و ڕەنگیان تێ هەڵبسێورێت. لەشگەلێک کە واتای خۆی لە پێوەندیەکدا بەرانبەر بە نیزامێک وەردەگرێت کە ناهێڵێت هیچ ئەندامێکی لەشی ئافرەت لە ژێر قەرزباریدا قووتاری بێت.

> قسەی وەك 'کەسانی ورگنی وەک تۆ ناشیرینن، و تۆ هەرگیز پیاوێکت دەست ناکەوێت تا ئا ئەمە سەروچاوت بێت'، یان قسەی دیکەی لەم جۆرە هەرگیز بە ڕوون و ئاشکرا نەگوتراون. لە بری ئەوە هەر هەبوونی خودی ورگێک دەکرێت بە بەشێک لە *چالاکی* و لە *کردارێکی* بە خراپ هەڵسەنگێندراو. ئاوا بەم جۆرەیە ئەوە مومکین دەبێت کە ئێمە وەک خودگەلێک بانگمان لێ بکرێت کە شێوەی ورگمان بگۆڕین، لەو ڕێگایەوە کە پەنا دەبردرێت و ڕوو دەکرێتە ئەو هەستی *بەرپرسیارێتیەی کە تیاماندایە* [...] کەواتە، خاڵی بڕیاردەر، بەرپریساربوونەکەیە: هەڵگرتنی ئەرکی بەرپرسیارێتی بۆ لەشمان. وا دادەنرێت کە ئێمە خۆمان بڕیار دەدەین و لەشمان لە ژێر کۆنترۆڵی خۆماندایە ـ هەرچەندە کە ئێمە بۆ نۆرمگەلێکی کۆمەڵایەتیانەی لەوەبەردانراو 'بەرپرسیار کراوین'. پرنسیپی بەرپرسیارێتیی لەوەش زیاتر نەک هەر بۆ ورگێک دەگەڕێتەوە، بەڵکو هەروەها فراوان دەبێت بۆ هەموو سەرتاپای لەش [...]. من بە کۆمەڵێک کەموکورتیەوە لەدایک بووم کە خۆم لێی بەرپرسیارم: لەناوبردنی ئەوانە دەبێت بە کاری ژیانم. هەرە بوونم لە جیهاندا دەبێت بە سەرچاوەیەکی هەمیشە حازر بۆ هەستیی گوناهباریی (قەرزباریی). (Haug 1987:127 f)

میتۆدگەلی بیروەریی بەو شێوەیە هەرە مەبەستی ئەوەیە کە لە دووبارەوەبەرهەمهێنانەوەی نیزامی دەستەڵاتی کۆمەڵایەتیی تێبگەیەنێت. لە بەر ئەو هۆیە کە بەسەرهاتە بیرەوەریەکان سەبارەت بە ئەزموونگەلی کۆنکرێتن، سەرنج دەبەنە سەر هەرە وردەکاریە ماناهەڵگرەکانی ژیانی ڕۆژانە، و دەگەینە تێگەیشتنێک کە چۆن نیزامی دەستەڵات لە هەموو ئەو شتانەشدایە کە ڕۆژانە و ناسەرەکین. فریگگا هاوگ نووسینەوەی بیرەوەریی بە کارێکی لێکدانەوە و دووبارەلێکدانەوەی ڕزگاریخوازانە دەنرخێنێت. کارێک کە مەبەستە هەرە بنچینەییەکەی لە کارتێکردنماندا دەردەکەوێت: "وامان لێ دەکات کە خودئاگایانە ژیانمان بەڕێوە ببەین" (Haug 1987:71).

## زمان، جنس و گۆڕان

لەو كاتەدا كە فێمێنیستەهەڵوێستگرەكان لەو دەروازەیەوە پێ هەڵدەگرن كە بەڕاستیی باسكردنی ڕاستەقینەی ئافرەتان شیاوە، هاوكات فێمێنیستانی دیكە شیاوبوونی ئەو ڕاستییە دەخەنە ژێرپرسیارەوە. لەبەرئەوەی كە ئەزموون و بەسەرهاتی ئافرەتان توڕدەدرێن و پەنهان دەكردرێن ئەوا *زمانێك* ونە كە باس لە سەرگوزشتەیان بكات.

كاترین ماككینۆن Catharine MacKinnon دەڵێت بەڵام ئافرەتان لە ڕێگای ئەو میتۆدە فێمێنیستییەوە كە پێی دەگوترێت "بڵندكردنی خودئاگا"٢ (consciousnessraising)، پێكەوە دەتوانن دووبارە ببنەوە بە خاوەنی ڕیئالیتەی خۆیان. ئافرەتان دەتوانن هێزی سەرفرازیی بدەن بە زمان و كاروكردارییی هەرەوەزییانە شیاو بكەن. میتۆدەكە وەك "بنیاتنانەوەیەكی نوێی ڕەخنەگرانەی هەرەوەزی بۆ مانای ئەزموونی كۆمەڵایەتیی ئافرەتان، بەو شێوەیەی كە ئافرەتان خۆیان گوزەری پیادا دەكەن" وەسف دەكرێت (MacKinnon 1989b:83).

بڵندكردنی خودئاگا هەروەك نووسینەوەی بیرەوەریی بەو واتایە دێت كە ئافرەتان پێكەوە ڕەخنەگرانە وەك ئافرەت ئەزموونگەلی خۆیان بكەن بە پرسیار. ئەمە دەتوانێت لە هەر هەلومەرجێكی هەمەجۆردا ڕوو بدات كە تیایدا ئافرەتان یەكتر دەبینن و لەسەر ژیانی خۆیان لەگەڵ یەك دەئاخفن. كاتێك كە ئەزموونە كەسیی و تاكەكەسییەكان بەیەك دەگەن، دۆخی هاوبەشی ئافرەتان دیار دەبێت. كاروكرداری هەرەوەزیی سیاسیی ئافرەتانە لەسەر ئەو دیدە لەنگەر دەگرێت كە ئافرەتان خاوەن ئەزموونگەلی هاوبەشن.

میتۆدی بڵندكردنی خودئاگا پێی وایە كە ئافرەتان دەتوانن شێوەیەكی تایبەت بە خۆیان بۆ جیهانبینی دروست بكەن كە پارسەنگێك یان دژبەرێكە بەرانبەر خودی پیاوانەكە. خاڵێكی ڕامانی دیكە ئەوەیە كە خودی زمان بەسەرهات و ئەزموونی ئافرەتان دەشێوێنێت. زمان ڕەنگدانەوەیەكی جنسیی بێدەنگیی تێدایە. شێوەگەل و وشەگەلی كەمتر ـ و كەمتریش ڕەوا ـ هەیە بۆ وەسفی ڕیئالیتەی ئافرەتان وەك لەوەی كە بۆ وەسفی پیاوان هەیە (Fredelius و كەسانی دیكە ١٩٩٤). نموونەیەك لەسەر زمان ئەوەیە كە وشەگەل نیین بۆ وەسفكردنی ئەوەی كە ئافرەتان وەك دایك دەیكەن. وشەی دایە باس لە دۆخێك دەكات نەك لە كاروكردارێك. دایە شتێكە كە ئافرەتێك ئەوەیە. لەبەر ئەوە ئوللا هۆڵم ـ ی فەیلەسوف Ulla Holm (١٩٩٣) زاراوەی *دایكایەتیكردن* (لە دۆخی كرداردا) Modrande بەكار دەبات بۆ ئەوەی دروست ئەو كارە لە چوارچێوە بگرێت كە ئافرەتان لە پێوەندیی لەگەڵ منداڵدا دەیكەن.

ڕەنگە هەرە دەربڕینێکی ڕوون بۆ چەوتێتی زمان ئەوە بێت کە گوزارەیەکی ڕۆژانە نییە بۆ ئۆرگانی زاووزێیی ئافرەتان کارا بێت.۳ هەروەها وشەش نییە کە نزمتێڕوانەر نەبێت بۆ وەسفی ئافرەتانێک کە خۆیان دەستپێشخەری سێکسیی دەکەن (Fredelius و کەسانی دیکە ١٩٩٤). بەڵام بە پیاوێک کە دەستپێشخەری سێکسی بکات دەڵێن زەوق هەستاو و توند. پیاو هەرگیز ناکرێت بە "بێحەیا".

نموونەیەکی دیکە ئەو زەحمەتەیە کە بتوانرێت ناو لەو هەستە دووفاقیی و ئاڵۆزانە بنرێت کە دەشێت ئافرەتان بەرانبەر سێکس هەیان بێت. ئافرەتان دەشێت زەوقیان بە پۆرنۆگرافیی هەڵسێت، هاوکات کە هەست بە بێزهاتنەوە و گوناهـ دەکەن. خۆ ئەم ڕیئالیتیەتە (واقیعە) لە ئەدەبی سێکسییدا ناوی نایەت. لە ئەدەبی سێکسییدا هەموو جۆرە وروژاندنێکی سێکسیی هەمیشە پڕ بە مانای وشە بە شتێکی خۆش پەسن دەکرێت (Jeffreys 1994). تا سێکسی زیاتر تێدا بێت، باشتر. نۆرمە پیاوانەکە، بەو شێوەیەی کە لە زمان و زانستدا دەردەبڕدرێت، ئەو واتایە دەدات کە هەستگەلی سێکسیی ئافرەتان هەر دەبێت پۆزەتیف (ئەرێنی) بن ـ دەنا بە سێکس دانانرێت.

> ئەدەبی ئازادیخوازیی هیچ وشە یان پۆلێنێکی بۆ وەڵامدانەوەی سێکسیی نییە کە پۆزەتیف نەبێت، هیچ وشەیەکی نییە لە دۆخێکی وادا بۆ پەسندانی ئاڵۆزێتیی هەستەکانمان بەکاری بهێنین. ئەمە ڕێککەوتێک نییە. بەشێکی توانایی تەکنیکی بۆ کۆنترۆڵکردنی سیاسیی، کۆنترۆڵکردنی زمانە. سەختە سەبارەت بە شتگەلێک کە هیچ وشەیەکیان بۆ دانەنراوە "بیربکرێتەوە". چاوەڕوان ناکرێت ئافرەتان بە شێوەیەک بەرانبەر سێکس بیربکەنەوە کە پۆزەتیف نەبێت. (Jeffreys 1994:65)

کە ئەزموونی پیاوان جڵەوی زانست دەگرێت و دەبێتە ڕەنگدانەوەی زمانەکەی هەر بەو واتایە نایەت کە ئەزموونی ئافرەتان لەدەرەوە دەهێڵدرێتەوە. بەو مانایەش دێت کە ئافرەتان بەرانبەر بە زانست شێوەپێوەندیەکی دژبەیەکیان دەدرێتێ. پاتریشیا فریتیۆف Patricia Frithiof ئەوە وا دەردەبڕێت کە ئافرەتان لەگەڵ ناهاوئاهەنگییەکی زمانیی بەردەوامدا ژیان دەبەنە سەر. کاتێک کە تێکستێک ئاماژە بە "پیاو" یان "ئەوی کوڕ" دەکات، ئەوا دەتوانێت مەبەستی پیاویش و ئافرەتیش بێت (Frithiof 1988). ئەوانە نازناوی گشتیین. هاوکات کە ئەوانە بێ هیچ گومانێک لە ڕاستیدا نازناوی جنسی پیاوان. ئافرەتان دەبێت بێ وەستان و وچان "ئامێرێکی زمان وەرگێڕانیان" هەڵ کردبێت کاتێک کە دەخوێننەوە. ئافرەت دەبێت هەمیشە لە خۆی بپرسێت: ئایا ئەمە منیش دەگرێتەوە؟ ئایا منیش لێرەدا هەم؟ ئافرەتان بە زەحمەت دەتوانن وەک بکەر خۆیان لە ناو تێکستەکەدا بدۆزنەوە

identifera sig. ئافرەتان لە پێوەندی لەگەڵ ئەوەدا کە دەیخوێننەوە لە هەستێکی نامۆییدا بەجێ دەهێڵرێن.

ڕیکارد ڕۆرتی Richard Rorty پێی وایە کە ئەگەر وشەکان لەلایەن پیاوانەوە و بۆ ئەوان دروست کرابن، ئەوا بۆ ئافرەتان دەبێت بە کێشە کاتێك ئەو زمانە وەک ستراتیژیەکی ڕزگاریی بەکار بهێنن. زمانی پیاوان ناتوانێت ئافرەتان لە چەوساندنەوەی پیاوان ڕزگار بکات. لەبەرئەوەی کە زمان ئامرازێکە کە لە ناو دەستی گرووپی باڵادەستدایە، ئەوا ناڕەواییێتیی وەک سرووشتیی دەبینرێت و لە ڕووی ڕەووشتییشەوە ڕەوا دەنوێنێت، تەنانەت بۆ خودی چەوساوەکانیش:

> تەنیا کاتێک کە کەسێک خەونێکی هەبێت، و دەنگێکی بۆ گوزارەکردنی ئەو خەونە هەبێت، ئەوی کە لە سرووشت دەچێت دەست دەکات بەوەی کە لە کولتور بچێت، ئەوی وەک چارەنووس دەهاتە بەرچاو دەست دەکات بەوەی کە ببێت بە ڕەووشتێکی بێزئاوەر. چونکە تا ئەو کاتە تەنیا زمانی چەوسێنەرەوان کارا دەبێت، و زۆربەی چەوسێنەرەوانیش وا زرنگن کە زمانێک فێری چەوساوەکان بکەن کە دەنگیان وەک شێت بێتە گوێ ـ *تەنانەت بە گوێی خۆیشیان* ـ ئەگەر بێن و وەسفی خۆیان *بە چەوساوە بکەن.* (Rorty 1991:3)

ئافرەتان دەبێت زمانێکی نوێ دروست بکەن کە بتوانێت ئەزموونی چەوساندنەوەیان ڕابگەیەنێت. زمانێکی نوێ هەروەها دەتوانێت ناسنامەیەکی ئافرەتیی وا بئافرێنێت کە لەسەر بناغەی ستەم دانەمەزرابێت. ئەمە زۆر سەبارەت بەوە نییە کە ڕیئالیتیەکی ئافرەتیی هەرەوەزیی یان "ڕاستەقینە" ئاشکرا بکرێت، بەڵکو زیاتر سەبارەت بە دروستکردنی کۆمەڵە مانایەکی نوێیە بۆ نازناوی ئافرەت. زمانێکی چڵک نەگرتوو مەرجی ڕزگارییە (Rorty 1991). ئەم دەلیلهێنانەوەیە نێزیکی جەختی فێمێنیستە پۆستمۆدێرنیستەکانە لەسەر ئەوەی کە هەموو شێوەی گۆڕانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی مەرجی دووبارەدامەزراندنەوەی زمان دەکات بە پێویستییەک. تەنیا ئەو کاتەی دەست پێ بکەین بە شێوەیەکی نوێ بدوێین و وشەگەلی نوێ دابهێنین، دەتوانین ڕیئالیتیە (واقیع) بگۆڕین.

> ئاخافتن و زمان ئامرازگەلێکن کە دەتوانن کار لەسەر گۆڕانەکانی دیکەش دابنێن، گۆڕینی کاروکرداری ئاخافتن و زمان بزوواندنێکی سیاسیی گرینگە [...] بۆ گۆڕینی ئەو نیزامە سیاسییەی ئێستا کە هەیە پێویستە وشەی نوێ بە شێوەیەکی نوێ بخرێتە کار؛ تا وشەی نوێی زیاتر و زیاتر چوارچێوەی نیزامە دامەزراوەکە بەجێبهێڵێت، بەرەنگاربوونەوەکەش بەرانبەر ئەو نیزامە ڕادیکالتر دەبێت [...] (Buker 1993:10 f)

گرینگ ئەوەیە کە وشەگەل و چەمکی نوێ دروست بکردرێن بۆ ئەوەی لە زمانی قفڵخواردووی لە ئارادابوو ڕزگارمان بێت. فێمێنیستە پۆستمۆدێرنیستەکان بەو شێوەیە دەڵێن کە پێ هەڵگرتن لە پۆلێنکردنی ئافرەتانەوە نموونەیەکە لە ئەڵقەلەگوێیی بۆ دەستەڵات. هەر خودی قسەکردن لەسەر ئافرەتان مانای پەسەندکردنی وەسفێکی سەرکوتگەرانە دەدات (بڕوانە لاپەڕە ٤٩). هەر وەسفێکی ئافرەتان وەک ژێردەستە و ستەملێکراو لە ڕاستییدا دەبێتە مایەی ڕاگرتنی ژێردەستەیی و ستەمەکە. بەم شێوەپەلاماردانە بیریارانە پۆستمۆدێرنەکان خۆ دەخەنە ناو ناکۆیەکەوە: هاوکات کە ئافرەتان دەبێت بۆ گۆڕانکاریی و سەربەخۆیی بدوێن، ئەو هەلەیان لەدەست دەردەهێندرێت کە ناوێک لە پێوەندیە دەستەڵاتە ئێستاییەکان بنێن. بەپێی ئەمان چەوساندنەوەی ئافرەتان کۆتایی پێ نایەت تا ئافرەتان لە ئافرەتبوون نەکەون. ئەگەر ئافرەتان پێ لەسەر ئافرەتبوونی خۆیان دابگرن، ڕزگاریی خۆیان مەحاڵ دەکەن.

## تێبینی

١. سەبارەت بە نووسینەوەی بیرەوەریی، بێلە Haug (١٩٨٧) هەروەها بڕوانە Widerberg (١٩٩٥).

٢. لە ناو سالآنی ١٩٦٠ ـ و ١٩٧٠ ـ کاندا ئافرەتان، لەسەرەتاوە بەزۆریی لە ئەمەریکا USA، شتێکیان بە ناوی "گرووپی بڵندکارەوەی خودئاگایی "raising groups consciousness" دامەزراند. ئەو ئافرەتانە تۆڕگەلێکیان لەگەڵ هاوڕێ و دەرودراوسێکانیان ڕێکخست و گرووپی جودا لە زانکۆکان و لە شوێنی کاردا دروست کران.

٣. لەبەرئەوەی ناو لە ئۆرگانی زاوزێی ئافرەت هەمیشە گیرگرفتی جۆراوجۆر دروست دەکات (هەر ناوێکی لێ بنرێت هەر هەڵە دەکەوێتەوە) ئەوا ڕۆژنامەی داگنس نیوهێتەر Dagens Nyheter لە کەمپانیایەکدا (١٩٩٥/٢/١٠) هەوڵیدا ناوی ڤولڤا(ن) Vulva(n) (زێ/لێوکە) بهێنێتە ئاراوە. ناوێکی دیکە کە لە سوێدیدا کەمتر زڕاوە و کە زیاتر بەربلآوە وشەی سنیپپان ـ Snippan.

## ٧

## ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت

تیئۆری فێمێنیستیی هەموو ئەو شتانە دەخاتە ژێرپرسیارەوە کە درۆزنانە بە سرووشتیی و بە بێگومان دادەنرێن. بەو جۆرە تیئۆری فێمێنیستیی ئەو پێوەندییە *سیاسییە* بناخەییەی نێوان جنس و دەستەڵات دەخاتە بەردەست و دەیخاتە ژێرپرسیارەوە و تاوتوێیان دەکات، باوەجودی ئەوەی کە شیکردنەوەکە سەبارەت بە دامەزراوەی سیاسیی و پرۆسێسی لەو جۆرە بێت، سەبارەت بە خێزان و سێکسیوالیتیە یان زانیاری و زمان بێت. هەرە ناکۆکی ناو سیاسەت ـ ئەوەی ئافرەتان دەستەڵاتیان کەمتر هەیە لەبەرئەوەی جنسیان ئافرەتە و هاوکات کە جنس وەک سیاسیی ناسەلمێندرێنرێت ـ بەو شێوەیە بە بەردەوامی لەلایەن فێمێنیزمەوە دژایەتی دەکرێت.

ڕامانی فێمێنیزم لەو *نیزامەوە* سەرچاوە دەگرێت کە پێوەندییەکانی دەستەڵاتی نابەرابەر لە نێوان جنسەکاندا بە پێوە ڕادەگرێت. ئەم ڕامانە لەناو جۆرەکانی فێمێنیزمدا هاوبەشە، ئەگەرچی جوداش وەسفی نیزامەدەستەڵاتەکە دەکەن. فێمێنیستە مارکسیستی و سۆشیالیستیەکان بۆ نموونە باس لە دابەشکردنی جنسیی کار دەکەن، هاوکات کە فێمێنیستە ڕادیکالەکان پێیان وایە کە سێکسیوالیتی ناوەند و خاڵی چەقە.

فێمێنیستەکان بۆ گۆڕینی نیزامی دەستەڵاتی جنسیی خاوەن ستراتیژی جودان. تیئۆریسانە جیاوازیخوازەکان دەیانەوێت کە نیزامە سیاسیەکە دووبارە لە خاڵی دەرچوونی جنسەوە بنیات بنرێتەوە. دامەزراوگەلی سیاسیی، یاسادەرکردن و ڕیفۆرمی سیاسی وایان لێ بکرێت کە ڕەچاوی هەردوو جنسەکەی مرۆڤ، پیاوان و ئافرەتانیش، بکەن. تیئۆریسانی یەکسانیخواز دەخوازن ڕێگایەکی دیکە بگرنە بەر. ئەمان باس لە بێلایەنیەکی جنسیی ئاییندەیی دەکەن کە دەشێت بکرێت و دەیخەنە جێی ئەو سیستەمە سیاسیە جنسبێلایەنە ساختەیەی کە ئێستا هەیە. بەو شێوەیە دەڵێن کە هەردوو تیئۆریی سیاسیی و پراکتیکی سیاسیی دەبێت کۆشش بکەن بۆ ئەوەی کە سەربەجنسبوون مانایەکی نەبێت. لەملاوە فێمێنیستە پۆستمۆدێرنەکان دەیانەوێت نیزامە دەستەڵاتەکە بەو شێوەیە تێک بدەن کە بیخەنە ژێرپرسیار و ئەم ناسنامەی کە ئەمڕۆ هەیە هەڵبووەشێننەوە. ئەوان پێیان وایە کە ناسنامەی مرۆڤ وابەستەی زمانە. زمانێکی نوێ و جیاواز لە توانایدا دەبێت کە ناسنامەی چەوسێنەوەر بگۆڕێت.

ئەم هەڵوێستوەرگرتنە جودایانە کە لە ناو تیئۆری فێمێنیستیدا هەن لەسەر بناخەی شێوەی تێڕوانینی جیاواز لە پۆلێنی جنس دامەزراون. ئایا دەتوانین خۆ لە جنس قووتار بکەین بۆ ئەوەی لەوێوە بگەینە بوونێکی پاشەڕۆژیی وا کە جنس تیایدا نە لەسەر ناسنامەی مرۆڤ بڕیاردەر بێت و نە لە پێوەندیی دەستەڵاتیشدا؟ یاخود هەر هەر کتومت مەحاڵە کە خۆ لە جنس لابدرێت، چ ئێستاش و چ لە ئاییندەشدا؟

لە تیئۆری فێمێنیستیدا شێوەی جودا بۆ تێگەیشتن و گرفتدارکردنی جنس هەیە. بەڵام ڕامانی هاوبەش ئەوەیە کە جنس هەشە و واتای سیاسیشی هەیە. ئەو خاڵی ڕامانی فێمێنیستیە خۆی لە خۆیدا گوللەیەکی تێکشکێنە دژ بە تیئۆری سیاسیی نەریتیی و دژ بەو تێگەیشتنە بەربلاوەی کە گوایە مرۆڤ وەک بوونەوەری سیاسیی دەبێت وەک تاکەکەسی جنسنەدار ببینرێت. ئەم جۆرە تێگەیشتنەی تیئۆری سیاسیی نەریتییە کە دەبێتە مایەی مانەوەی نیزامی دەستەڵاتی جنسیی ـ کە پێوەندی نێوان جنس و دەستەڵات نەبینراو دەکات.

بەو شێوەیە فێمێنیزم لەو ڕێگایەوە کە بەبەردەوامیی پێوەستی نێوان جنس و دەستەڵات دەخاتە ڕوو و هەروەها کە ئاماژە بە بێلایەنیی جنسیی ساختەی تاکەکەس دەکات، بەرەنگاری نیزامی دەستەڵات دەبێت و دژی دەوەستێت. چەمکی تاکەکەس "پیاو" دەکات بە نۆرم. نۆرمێک کە لە خۆیدا هێندە بێگومانە کە تەنانەت ناش بیندرێت ـ هاوکاتیش نۆرمێکی وا بناخەییە کە هەموو هەوڵێک بۆ خۆلادان لێی، دەبێت بە بەرپرسیاریی کەسی *لادەر*. پیاوان تاکەکەس و مرۆڤن. ئەوان هەرگیز پێویستیان بەوە نییە کە خۆ(یان)، بوون(یان) یاخود ناوەڕۆک(یان) پێناسە بکەن. بەڵام ئافرەتان، لادەرن. لەبەرئەوەی لادانێک تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ نۆرمێکدا دەبێت بە لادان، ئەوا دروست لە پێوندیی خۆیدا لەگەڵ نۆرمەکە/پیاوان کە لادەرەکە/ئافرەتان پێویست دەبێت بە تایبەتی بکرێن.

پرسیارە دووپاتەکە کە دەپرسێت جنس *چییە*، بەو شێوەیە هەر خۆی پەردە لەسەر هەبوونی نیزامی دەستەڵات هەڵدەداتەوە و بیچمێکی دەداتێ. بەڵام لۆژیکی ئەو نیزامی دەستەڵاتە فێمێنیزم دەخاتە ناو ناکۆکیەکیەوە. بۆ ئەوەی داوای فێمێنیستیی بۆ گۆڕانکاریی لە ناو پێوەندیە دەستەڵاتە جنسییەکاندا وەک ڕەوا لێی تێبگەیرێت دەبێت ئافرەتان پێناسە بکرێن. دەبێت بە ڕوونی دیاری بکرێت کە ئافرەتان چۆن لە نۆرمە پیاوانەییەکە لادەدەن. دواتر ناکۆکییەکە نیشانی دەدات کە پێوەندی لە نێوان جنس و گۆڕانکاریی سیاسیدا بە قووڵیی کێشەدارە و جێی بێنەوبەرەیەکی قووڵە.

کاتێک فێمێنیزم نیزامی دەستەڵات دەخاتە ژێر پرسیارەوە "ناکۆکیەکانی ناو سیاسەت" دەردەکەون. بەو شێوەیە فێمێنیزم ئەو ناکۆکیانە دەخاتە بەردەست و هەوڵ دەدات لێیان تێ بگات  کە نیزامی دەستەڵاتی جنسیی هەم لەلایەکەوە لەسەریان دامەزراوە و هەم لەلایەکەوە هەر خۆی نەبینراویشیان دەکات. هاوکات ئەو ناکۆکیانە لە دامەزراوەتیئۆریە فێمێنیستیەکانیشدا ڕەنگ دەدەنەوە.

بەڵام بە هەرحاڵ، ئەوە گرینگە کە نکۆڵی لە خۆدژگوتنەکان و ناکۆکیەکان نەکرێت. لە کۆتاییدا، دروست لە ڕێگای ئاماژەکردن بە چەوتێتی، لە ڕێگای ئاشکراکردنی ناکۆکییەکان و پەردەهەڵدانەوە لەسەر ناکۆیەکانە کە فێمێنیزم دەتوانێت بەرەنگاری ئەو نیزامە دەستەڵاتە بێتەوە کە پراکتیکی سیاسی و تیئۆری سیاسیی پێکەوە بە پێوە ڕایان گرتووە.

**Litteraturförteckning**

Acker, Joan (1995) ”Feminist Goals and Organizing Processes”, i Feminist Organizations: Harvest of the New Women's Movement, M M Ferree & P Y Martin (red), Philadelphia, Temple University Press.
Alcoff, Linda (1988) ”Cultural Feminism Versus Poststructuralism: The Identity Crisis in Feminist Theory”, i Signs, vol 13, nr 3.
Armstrong, Pat & Armstrong, Hugh (1986) ”Beyond Sexless Class and Classless Sex: Towards Feminist Marxism”, i The Politics of Diversity, R Hamilton & M Barrett (red), London, Verso.
Barry, Kathleen (1995) The Prostitution of Sexuality. New York & London, New York University Press.
Beauvoir, Simone de (1949) Le Deuxième Sexe II. Paris, Editions Gallimard.
Beauvoir, Simone de (1949; 1970) The Second Sex. New York, Alfred A Knopf.
Bobbio, Noberto (1990) Liberalism and Democracy. London, Verso.
Borchorst, Anette & Siim, Birte (1987) ”Women and the Advanced Welfare State – a New Kind of Patriarchal Power?”, i Women and the State: The Shifting Boundaries of Public and Private, A Show¬stack Sassoon (red), London & New York, Routledge.
Borelius, Maria (1993) Sedan du fött. Om den nyblivna mammans kropp och själ. Stockholm, Fischer & Co.
Brown, Wendy (1988) Manhood and Politics: A Feminist Reading in Political Theory. New Jersey, Rowman & Littlefield.
Buker, Eloise (1993) ”Postmodern Feminist Rhetoric and Political Prac¬tices”. Paper presenterat vid American Political Science Association möte i Washington, augusti 1993.
Butler, Judith (1990) Gender Trouble: Feminism and the Subversion of Identity. New York, Routledge.
Butler, Judith (1993) Bodies that Matter: On the Discursive Limits of 'Sex'. London & New York, Routledge.
Cavarero, Adriana (1992) ”Equality and Difference: Amnesia in Political
Thought”, i Beyond Equality and Difference: Citizenship, Feminist Politics and Female Subjectivity, G Bock & S James (red), London & New York, Routledge.
Christenson, Eva (1994) ”Att problematisera heterosexualitet – Reflek¬tioner utifrån ett lesbiskt perspektiv”. Stockholms universitet, Stats¬vetenskapliga institutionen.
Coole, Diana (1993) Women in Political Theory: From Ancient Misogyny to Contemporary Feminism. Hertfordshire, Harvester Wheatsheaf.
Dahl, Robert A (1956) A Preface to Democratic Theory. Chicago, University of Chicago Press.
Dahlerup, Drude (1994) ”Learning to Live with the State”, i Women's Studies International Forum, vol 17, nr 2–3.
Danius, Sara (1995) ”Själen är kroppens fängelse: Om den vanskliga distinktionen mellan kön och genus”, i Feministisk Bruksanvisning, C Lindén & U Milles (red), Stockholm, Norstedts.
Dietz, Mary (1992) ”Context is all: Feminism and Theories of Citizen¬ship”, i Dimensions of Radical Democracy: Pluralism, Citizenship, Community, C Mouffe (red), London & New York, Verso.
Dworkin, Andrea (1987) Intercourse. New York, The Free Press.
Eagle Russett, Cynthia (1989) Sexual Science: The Victorian Con¬struction of Womanhood. Cambridge, Harvard University Press.
Easlea, Brian (1981) Science and Sexual Oppression. Patriarchy's Confrontation with Woman and Nature. London, Weidenfeld and Nicolson.

Easlea, Brian (1983) Fathering the Unthinkable: Masculinity, Scientists and the Nuclear Arms Race. London, Pluto Press.
Eduards, Maud (1992) "Against the Rules of the Game. On the Importance of Women's Collective Actions", i Rethinking Change. Current Swedish Feminist Research. HSFR, Uppsala.
Eduards, Maud (1993) "Politiken förkroppsligad", i Politikens väsen: Idéer och institutioner i den moderna staten, B von Sydow, G Wallin & B Wittrock (red), Stockholm, Tidens Förlag.
Eisenstein, Hester (1995) "The Australian Femocratic Experiment: A Feminist Case for Bureaucracy", i Feminist Organizations: Harvest of the New Women's Movement, M M Ferree & P Y Martin (red), Philadelphia, Temple University Press.
Eisenstein, Zillah R (1988) The Female Body and the Law. Berkeley, University of California Press.
Ellis, John (1992) "On Pornography", i The Sexual Subject: A Screen Reader in Sexuality, London & New York, Routledge.
Elman, Amy R (1996) Sexual Subordination and State Intervention. Providence Rhode Island, Berghahn Books.
Elshtain, Jean B (1981) Public Man, Private Woman. Princeton, Princeton University Press.
Eskilsson, L & Bergenheim, Å (red), (1995) Förnuft – Fruktbarhet – Förälskelse, idéer om kvinnor och kvinnors idéer. Stockholm, Carlssons.
Fee, Elizabeth (1983) "Womens Nature and Scientific Objectivity", i Womens Nature: Rationalizations of Inequality, R Hubbard & M Lowe (red), New York, Pergamon Press.
Fredelius, Gunilla, Frithiof, Patricia & Ursing, Ingrid (1994) Kvinno¬identitet. Stockholm, Natur och Kultur.
Freud, Sigmund (1931; 1961) "Lecture XXXIII, Femininity", i Standard Vol XXII. London, Hogarth.
Frithiof, Patricia (1988) "The Psychologies of Women – Themes and Variations", i Kvinnors identitetsutveckling. JÄMFO rapport nr 13, Stockholm.
Gatens, Moira (1992) "Power, Bodies and Difference", i Destabilizing Theory: Contemporary Feminist Debates, M Barret & A Phillips (red), Stanford, Stanford University Press.
Gilligan, Carol (1985) Med kvinnors röst. Stockholm, Prisma.
Grant, Judith (1993) Fundamental Feminism. Contesting the Core Concepts of Feminist Theory. London, Routledge.
Haraway, Donna J (1981) "In the Beginning was the Word: The Genesis of Biological Theory", i Signs, vol 6, nr 2.
Hartmann, Heidi (1981) "The Unhappy Marriage of Marxism and Feminism", i Women and Revolution: A Discussion of the Unhappy Marriage of Marxism and Feminism, L Sargent (red), London, Pluto Press.
Haug, Frigga (1987) Female Sexualization: A Collective Work of Memory. London, Verso.
Hawkesworth, Mary E (1990) Beyond Oppression. Feminist Theory and Political Strategy. New York, Continuum.
Hernes, Helga Maria (1982) Staten – kvinner ingen adgang? Kvinners levekår og livsløp. Oslo, Universitetsforlaget.
Hernes, Helga Maria (1987) Welfare State and Woman Power: Essays in State Feminism. Oslo, Universitetsforlaget.
Hill Collins, Patricia (1993) "Towards a New Vision: Race, Class and Gender as Categories of Analysis and Connection", i Race, Sex and Class, vol 1, nr 1.
Hirdman, Yvonne (1988) "Genussystemet – reflexioner kring kvinnors sociala underordning", i Kvinnovetenskaplig Tidskrift, vol 9, nr 3.
Hirdman, Yvonne (1990) "Genussystemet", i Demokrati och makt i Sverige: Maktutredningens huvudrapport, SOU 1990:44. Stockholm, Allmänna Förlaget.

Holm, Ulla M (1993) Modrande & praxis: En feministfilosofisk under¬sökning. Göteborg, Daidalos.
Holmstrom, Nancy (1984) ”A Marxist Theory of Women's Nature”, i Ethics, vol 94, april.
Honig, B (1992) ”Toward an Agonistic Feminism: Hannah Arendt and the Politics of Identity”, i Feminists Theorize the Political, J Butler & J W Scott (red), London & New York, Routledge.
Jaggar, Alison M (1983) Feminist Politics and Human Nature. New Jersey, Rowman & Allanheld Publishers.
Jagose, Annamarie (1996) Queer Theory: An Introduction. New York, New York University Press.
Jansson, Maria (1994) ”Om skillnader mellan skillnader, och andra skill¬nader i feministiska teorier”. Stockholms universitet, Statsvetenskap¬liga institutionen.
Jeffreys, Sheila (1994) ”Creating the Sexual Future”, i The Woman Question, M Evans (red), London, Sage Publications.
Johannisson, Karin (1994) Den mörka kontinenten: Kvinnan, medicinen och fin_de_siècle. Stockholm, Norstedts.
Jónasdóttir, Anna (1988) ”On the Concepts of Interest, Women's Inte¬rests, and the Limitations of Interest Theory”, i The Political Inte¬rests of Gender: Developing Theory and Research with a Feminist Face, K B Jones & A Jónasdóttir (red), London, Sage Publications.
Jónasdóttir, Anna (1992) ”Har kön någon betydelse för demokratin?”, i Kontrakt i Kris: Om kvinnors plats i välfärdsstaten, G Åström & Y Hirdman (red), Stockholm, Carlssons.
Keller, Evelyn Fox (1985) Reflections on Gender and Science. New Haven, Yale University Press.
Kessler, Suzanne J & McKenna, Wendy (1985) Gender: An Ethno¬methodological Approach. Chicago, University of Chicago Press.
Kulick, Don (1996) ”Queer Theory: Vad är det och vad är det bra för?”, i lambda nordica, vol 2, nr 3–4.
lambda nordica (1996) vol 2, nr 3–4.
Larsson, Torbjörn (1994) Det svenska statsskicket. Lund, Student¬litteratur.
Laqueur, Thomas (1990) Making Sex: Body and Gender from the Greeks to Freud. Cambridge, Harvard University Press.
Lloyd, Genevieve (1984) The Man of Reason: Male and Female in Western Philosophy. London, Routledge.
Lorde, Audre (1994) ”Age, Race, Class and Sex: Women Redefining Difference”, i The Woman Question, M Evans (red), London, Sage Publications.
Lundgren, Eva (1990) Gud og Hver Mann. Oslo, Cappelen.
Lundgren, Eva (1993) Det får da vaere grenser for kjønn: Voldelig empiri og feministisk teori. Oslo, Universitetsforlaget.
MacKinnon, Catharine A (1989a) ”Sexuality, Pornography and Method: 'Pleasure under Patriarchy' ”, i Ethics, vol 99, January.
MacKinnon, Catharine A (1989b) Toward a Feminist Theory of the State. Cambridge, Harvard University Press.
MacKinnon, Catharine A (1991) ”From Practice to Theory, or What is a White Woman Anyway?”, i Yale Journal of Law and Feminism, vol 3, nr 13.
Mansbridge, Jane (1993) ”Feminism and Democracy”, i Democratic Community, J W Chapman & I Shapiro (red), New York, New York University Press.
Millett, Kate (1969) Sexual Politics. London, Virago.
Moi, Toril (1994) ”Att erövra Bourdieu”, i Kvinnovetenskaplig Tid¬skrift, vol 15, nr 1.
Moi, Toril (1997) ”Vad är en kvinna? Kön och genus i feministisk teori”, i Res Publica, vol 35/36, nr 1–2.

Morgan, Patricia (1982) ”From Battered Wife to Program Client – State Shaping of Social Problems”, i Kapitalistate, nr 9.
Mouffe, Chantal (1992) ”Feminism, Citizenship, and Radical Politics”, i Feminists Theorize the Political, J Butler & J Scott (red), New
York, Routledge.
Nuke Collection (1993) Riksutställningar, Stockholm.
Okin, Susan Moller (1989) Justice, Gender and the Family. New York, Basic Books.
Okin, Susan Moller (1991) ”John Rawls: Justice as Fairness – For Whom?”, i Feminist Interpretations and Political Theory, C Pateman & M L Shanton (red), Cambridge, Cambridge Polity Press.
Outshoorn, Joyce (1994) ”Being present to make difference visible? ’Parity Democracy’ and the question of the political representation of women”, Paper presenterat vid 1994 Annual Meeting of the American Political Science Association, New York.
Pateman, Carole (1988) The Sexual Contract. Cambridge, Polity Press.
Pateman, Carole (1989) The Disorder of Women. Democracy, Femi¬nism and Political Theory. Cambridge, Polity Press.
Phillips, Anne (1991) Engendering Democracy. Cambridge, Polity Press.
Phillips, Anne (1993) Democracy and Difference. Cambridge, Polity Press.
Puranen, Bi (1994) Att vara kvinna är ingen sjukdom. Stockholm, Norstedts.
Rawls, John (1971) A Theory of Justice. Oxford, Oxford University Press.
Rich, Adrienne (1980) Compulsory Heterosexuality and Lesbian Existence", i Signs, vol 5, nr 4.
Rorty, Richard (1991) ”Feminism and Pragmatism”, i Radical Philosophy, vol 59, fall.
Rubin, Gayle (1975) ”The Traffic in Women: Notes on the ’Political Economy’ of Sex”, i Toward an Anthropology of Women, R R Reiter (red), New York, Monthly Review Press.
Ruddick, Sara (1989) Maternal Thinking. Towards a Politics of Peace. London, The Women’s Press.
Sainsbury, Diane (red), (1994) Gendering Welfare States. London, Sage Publications.
Scott, Joan W (1993) ”Kvinnor som bara har paradoxer att erbjuda: Fransk feminism 1789–1945”, i Häften för kritiska studier, vol 26, nr 4.
Scott, Joan W (1996) Only Paradoxes to Offer: French Feminists and the Rights of Man. Cambridge, Harvard University Press.
Siim, Birte (1994) ”Køn, medborgerskab og magt”, i Kvinder, Køn & Forskning, vol 3, nr 3.
Sledziewski, Elisabeth G (1992) ”The democratic principle of equal representation – Forty years of Council of Europe activity”, Council of Europe.
Smih, Dorothy (1987a) ”Women’s Perspective as a Radical Critique of Sociology”, i Feminism and Methodology, S Harding (red), Bloomington, Indiana University Press.
Smith, Dorothy (1987b) The Everyday World As Problematic:A Feminist Sociology. Boston, Northeastern University Press.
Smith, Dorothy (1989) ”Sociological Theory: Methods of Writing Patriarchy”, i Feminism and Sociological Theory, R A Wallace (red), London, Sage Publications.
Spelman, Elizabeth (1988) Inessential Woman: Problems of Exclusion in Feminist Thought. Boston, Beacon Press.
Sprat, Thomas (1997; 1958) History of The Royal Society. Saint Louis, Washington University Studies.
Taylor, Charles (1989) Sources of the Self: The Making of the Modern Identity. Cambridge, Cambridge University Press.
Uvnäs Moberg, Kerstin & Robert, Rigmor (1994) Hon och Han. Födda olika. Stockholm, Brombergs.

Violi, Patrizia (1992) ”Gender, Subjectivity and Language”, i Beyond Equality and Difference: Citizenship, Feminist Politics and Female Subjectivity, G Bock & S James (red), London & New York, Routledge.
Voet, Rian (1992) ”Political Representation and Quotas: Hannah Pitkin's Concept of Representation in the Context of Feminist Politics”, i Acta Politica, nr 4.
Waerness, Kari (1984) ”The Rationality of Caring”, i Economic and Industrial Democracy, vol 5, nr 1.
Watson, Sophie (1990) ”The State of Play: An Introduction”, i Playing the State: Australian Feminist Interventions, S Watson (red), London & New York, Verso.
Widerberg, Karin (1995) Kunskapens kön: Minnen, reflektioner och teori. Stockholm, Norstedts.
Women and Revolution: A Discussion of The Unhappy Marriage of Marxism and Feminism, (1981) L Sargent (red), London, Pluto Press.
Young, Iris Marion (1987) ”Impartiality and the Civic Public”, i Feminism as Critique, S Benhabib & D Cornell (red), Cambridge, Polity Press. Young, Iris Marion (1989) ”Polity and Group Difference: A Critique of the Ideal of Universal Citizenship”, i Ethics, vol 99, January.
Young, Iris Marion (1990) Throwing like a Girl and Other Essays in Feminist Philosophy and Social Theory. Bloomington & Indiana¬polis, Indiana University Press.
se, Cecilia (1993) ”Individ utan innehåll”, i Statsvetenskaplig tidskrift, vol 96, nr 2.